دیل کارنگی

# چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دەکەیت؟

وەرگێڕانی: مەشخەڵ کەوڵۆسی






Dale Carnegie

# پێڕست

# پێشەکی

ئایا هەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کەزۆربەمان، بەشی زۆری تەمەنمان لەنێو کارکردندا بەسەردەبەین... ئیتر جۆری ئەو کارکردنە هەرچی بێت؟ .

ئەمەش مانای وایە، ڕەنگە دید وتێڕوانینی ئێمە بۆ کارکردن، بۆمان دیاری بکات ئایا ڕۆژەکانی ژیانمان پڕن لەهەڵچون وهەست کردن بەسەرکەوتن لەکاردا-یان بەپێچەوانەوە-پڕن لەچەپاندن وشەکەتی وبێ ئومێدی.

مەشقەکانی دیل کارنگی، تەرخانکراون بۆ ئەوەی یارمەتیت بدەن لەوەدا کەچۆن بتوانیت زۆرترین سودلە ڕۆژانی کارکردن وتەنانەت لەتەواوی ماوەی ژیانت، وەربگریت.

کاتێ ئەم لاپەڕانە دەخوێنیتەوە، هەست بەتێگەشتنێکی قوڵتر دەکەیت لەژیان ولەخەڵك، لەدوایدا دەست دەکەیت بەبنیات نانی هێزو تواناکان ودۆزینەوەی زۆرێك لەو بەهرە وتوانایانەت کەلەبەردا پێیان ئاشنا نەبوویت.

ئەبێ چەندە خۆشحاڵ بیت کاتێ ئەو بەهرەو توانا شاردراوانەت بەکار دەهێنیت؟ .

ئەم کتێبە، بریتیە لەچەند بەشێك، کەلەباشترین دوو کتێبی (کارنگی) هەڵبژێردراون. دوو کتێبەکەش بریتین لە(چۆن هاوڕێ پەیدا دەکەیت وکاریگەری لەسەر خەڵك دادەنێیت؟ ) هەروەها ( واز لە دوودڵی بهێنە ودەست بەژیان بکە).

تۆ دەتەوێت هیواکانت لەژیاندا بەدەست بێنیت، هەوڵ دەدەیت هەست بەشادومانی وئومێد بکەیت وکەڵك لە ووزە شاردراوەکانی نێو ناخت وەربگریت.ئەم پەرتوکە یارمەتیت ئەدات بۆ ئەوەی بەو ئامانجەت بگەیت.

خوێندنەوەی ئەم پەڕاوە، وەك سەرە ڕۆییەك وایە بۆ دۆزینەوەی خود، بۆیە دوورنیە ببێتە خاڵی وەرچەرخان لەژیانتدا.

تۆ لەنێو ناختدا کۆمەڵێ وزەی شاردراوەت هەیە، بۆی هەیە بەکارهێنانی ئەو وزانە ژیانت ڕازاوە وخۆش بکات... ئێستاش تەنها پێویستیت بەسوور بوون هەیە لەسەر تەقاندنەوە وبەکار هێنانی توانا و وزە شاردراوەکانی نێو ناخت.

دۆرۆسی کارنگی

سەرۆکی پەیمانگای کارنگی وهاوڕێکانی

# دەروازەی یەکەم

## حەوت ڕێگە بۆ دڵنیایی وبەختەوەری

کارنگی، ئەم پەرتوکەی بۆیە داناوە، تاکو دەرکەوێت ژیان بریتیە لەوەی ئێمە دەیکەین.

***ئەگەر فێر بووین:***

**خۆمان قبوڵ بکەین، بەڕوونی تایبەتمەندی وناتەواویەکانی خۆمان ببینین... لێرەوە کاری پێویست بکەین بۆ گەشتن بەئامانجەکانمان... بەو جۆرە ئارەزوی کات کوشتن و وزە بەفیڕۆدان لەناخماندا پاشەکشە دەکات وئەو ئارە زووە بزر دەکەین.**

# بەشی یەکەم
## خۆت بدۆزەرەوە وهەوڵ بدە خۆت بیت!

نامەیـەکم لـەخاتوو(ئـەدیت ئـەلرد) ەوە پێگەیـشت، ئـەو خاتوونـە لەباکوری کارۆلینا نیشتەجێیە، لەنامەکەیدا دەڵێت: (کەمنداڵ بووم زۆر شەرمن وکەمڕوو بووم، کێشی لەشیشم لەزیاد بونێکی ئاشکرادا بوو، لەڕاستیدا کوڵمـە سورەکانم دەبونـە هـۆی ئـەوەی قەڵـەوتر لەئەنـدازەی ڕاستەقینەی خـۆم دەربکـەوم. دایکـم ئـافرەتێکی موحافیزکـاربوو، پێـی وابوو دیزاینی جل وبەرگی جوان و ڕازاوە، بێ ئەقڵی ونەفامیە.هەمیشە دەیگوت: (جلی دەڵب زیاتر دەمێنێتەوە لەجلی تەسک وتروسک کەخێرا دەدڕێ) بەردەوام هەوڵیشی ئەدا، بەگوێرەی ئەو پرەنسیپە جل وبەرگ بپۆشم.

هەرگیز نەدەچومە هیچ ئاهەنگێك، کاتیشم بەیاری کردن وپێکەنینەوە بەسەر نەدەبرد، کەچوشمە قوتابخانە، بەشداری هیچ جۆرە چالاکیەکی دەرەکـی قوتابییـەکانم نـەدەکرد، تەنانـەت لەڕاهێنانـە وەرزشیەکانیـشدا. چونکە زۆر شەرمن بووم، هەستم دەکرد لەهەموو قوتابییەکان جیاواز ترم و، ئەوان حەزیان بەبوونی من لەناو خۆیاندا نیە!!.

(کاتێکیش گەورە بووم، شوم بەپیاوێکی لەخۆم گەورەتر کرد. وەلێ لەدەرونەوە نەگۆڕابووم. خێزان وبنەماڵەی مێردەکەم بەهێزبوون ومتمانەیان بەخۆیان هەبوو. زۆر هەوڵمدا وەکو ئەوان وابم، وەلێ شکستم هێنا. هەرچەندە ئەوان هەوڵیان ئەدا لەو مۆڵ خواردنە بەدەوری خۆمدا قوتارم بکەن، من زیاتر بەرەو گۆشەگیری دەچووم... وام لێهات زۆر تووڕە ببووم، خۆم لەهەموو هاوڕێکانم بەدوور دەگرت. حاڵم زۆر شڕبوو، تەنانەت ڕقم لەدەنگی زەنگ بوو کەلێی دەدا... کەسێکی شکست خواردوو بووم، زۆر باش ئەوەم دەزانی، بەڵام دەترسام لەوەی هاوسەرەکەم بەو ڕاستیە بزانێت.

لەبەر ئەوە لەهەنێ ئاهەنگدا بەشداریم دەکرد وهەوڵم ئەدا دەم بەخەندە وخۆشحاڵ خۆم پیشان بدەم، زۆرم لەخۆم دەکرد وادەربکەوم، هەرچەندە دەشمزانی دواتر هەست بەبەدبەختی وچارەڕەشی دەکەم! تاوام لێهات تەواو هەستم بەنەگبەتی خۆم دەکرد وگەشتمە ئەو بڕوایەی کەژیانی من هیچ کەڵك وسودێکی نیە ودەستم کردە بیرکردنەوە لە(خۆکوشتن)!.

ئەی ئەبێ پاشتر چی ڕوی دابێت وژیانی ئەم ژنە چارەڕەشەی گۆڕیبێت؟

تێبینی‌یەك کەبەڕێکەوت گوێی لێ بوو!

خاتوو (ئەلرد) بەردەوام دەبێت لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی خۆی ودەڵێت: (جارێکیان بەڕێکەوت گوێم لەتێبینیەك بوو، ئەو تێبینیە سەرتاپای ژیانمی گۆڕی، گوێم لێ بووپورم باسی لەپەروەردە کردنی منداڵەکانی دەکرد... دەیگوت: (هەمیشە داوام لێدەکردن هەوڵ بدەن

خۆیان چۆنن، هەروابن وهەرواش خۆیان پیشان بدەن)! ئەم ڕستەیە کاری لێکردم.زۆر بەخێرایی تێگەیشتم کەمن بەدبەختیم هێناوە بەسەر خۆمدا، بەوەی خۆم خستۆتە نێو چوار چێوەیەکی نەگونجاوەوە.

لەماوەی شەو وڕۆژێکدا گۆڕام، هەوڵم ئەدا خۆم چۆنم، وەها خۆم نیشان بدەم، هەوڵمدا لێکۆڵینەوەیەك لەسەر خۆم بکەم، خۆم بدۆزمەوە. لەخاڵە لاواز وبەهێزەکانی نێو ناخم کۆڵیمەوە... تاوتوێی هەموو ڕەنگەکان وجل وبەرگەجیاجیاکانم کرد، ئەوەیانم هەڵبژارد کەلەگەڵمدا دەگونجا. توانیم هاوەڵ پەیدابکەم.پەیوەندیم بەڕێکخراوێکی ژنانەوە کرد- هەرچەندە لەسەرەتاوە ڕێکخراوێکی بچکۆلانەش بوو- زۆر ترسام کەیەکەمجار خستیانمە نێو بەرنامەکانی خۆیانەوە، وەڵ هەرگا پێویستی بکردایە من قسەبکەم، پەیتا پەیتا ئازایەتیم پەیدا دەکرد... ئەم بگرەو بەردەیە کاتێکی زۆری خایاند-بەڵام ئەمڕۆ، هەست بەبەختەوەریەکی زیاتر دەکەم، کەلەبەردا خەونیشم پێوە نەدەبینی!.

لەپەروەردە کردنی منداڵەکانمدا، هەمیشە هەوڵم ئەدا ئەو پەندەیان فێربکەم کەلەئەنجامی ئەزمونە تاڵەکەی خۆمەوە فێری ببوم: هەوڵ بدە خۆت چۆنیت، هەروابیت!.

مەسەلەی ئارەزوو کردنی ئەوەی خۆت چۆنیت، وەك دکتۆر (جیمس گۆردون گیلکی) دەڵێت: (بەقەدەر کۆنی مێژوو، کۆنە!). لەبەرانبەریشدا، ئارە زوونەکردنی ئەوەی خۆت چۆنیت وەهابیت و، وەها خۆت نیشان بدەیت، هۆکاری ڕاستەقینەی پشتی هەموو گرێ دەرونی ونەخۆشینە دەماریەکانە.

(ئـەنگیلۆ) سـیازدە پـەرتوك وهـەزاران وتـاری ڕۆژنامـەیی لـەبارەی پەروەردە كردنی منداڵەوە نوسیوە، ئەو دەڵێت: (هیچ بەدبەختێ نیە، بەدبەخت تربێت لەو كەسەی كەهەوڵ ئەدات كەسێكی جیاواز تربێت لەخۆی، چ وەك جەستەیان وەك ئەقڵ)!.

لـە (هۆلیـۆد) هەوڵـدان بـۆ ئـەوەی كەسـێكی جیاوازتربیـت لـەخۆت، شتێكی باوە... (سام وۆد) كەیەكێكە لە بەرهەم هێنەرە بەناوبانگەكانی پێشولە (هۆلیـۆد)دا، دەڵێـت: نارەحـەت تـرین گرفتـیٚ كـەڕوو بـەڕووی دەبومـەوە، بریتـی بـوو لەقەناعـەت كـردن بەئەكتـەرە لاوەكـان تـاكو كەسایەتی خۆیان لەڕاستیدا چۆنە، بەو شێوەیە هەڵس وكەوت بكەن. هەریەكەیان دەیان ویست ببنە (لانا تۆرنەر) ی پلە دوو، یان ببنە (كلارك گیبل) ی پلەی سێ.هەمیشە دەیگوت: (جەماوەر تامی كارەكانی ئەو ئەكتەرانەی كردووە، ئێستاش جۆرە كارێكی جیاوازی دەوێت).

كاتێ فیلمی (خواحافیز بەڕێز چیلپس) و(زەنگ بۆكێ لێ دەدات) ی بەرهەم هێنا، چەند ساڵێك بەردەوام كاری كرد بۆ هەڵبژاردن وبەرە و پێشەوە بردنـی ئەكتـەری تـازە.ئەوەشـی ڕاگەیانـد كەئـەو بنەمایانـەی لـەجیهانی كاركردنـــدا بـــەكار دەهێنـــرێن، هـــەمان ئـــەو بنەمایانـــەن كەلەسینەماشدا بەكار دەهێنرێن.

تـۆ ناتوانیـت ڕۆڵـی مـەیمون ببینیـت یـاخود ببیتـە تـوتی. (سـام وۆد) هەروەها دەڵێت: (ئەزمونەكانم فێریان كردم، دەست بەرداری هـەموو ئەو كەسـانەبیم كەهـەوڵیان ئـەدا بەشـێوەیەكی جیـاواز لەهەقیقـەتی خۆیـان، نمایشی خۆیان بكەن).

لە(پۆل بۆینتۆن) ی بەڕێوەبەری (بەکارخستن)ەکانی کۆمپانیای پترۆڵی (سۆکۆنی ڤاکیۆ) م پرسی: گەورەترین هەڵە کامەیە، کەئەوکەسانەی داوای کارکردن دەکەن، ئەنجامی دەدەن ؟ . ئاخەر ئەو پێویستە وەڵامیئاوا پرسیارێك بزانێت، چونکە چاوپێکەوتنی لەگەڵ شەست هەزار کەسدا ئەنجامداوە لەوانەی داوای کارکردنیان پێشکەش کردووە. کتێبێکیشی نوسیوە بەناوی (شەش ڕێگە بۆبەدەست هێنانی کار)... لەوەڵامی پرسیارەکەمدا گوتی: (گەورەترین هەڵەیەك ئەوکەسەی داوای کارکردنی پێشکەش کردوە ئەنجامی دەدات، لەوەدایە کەلەبریتی ئەوەی بەڕەحەتی وڕاشکاوی بدوێت، پەنادەباتە بەر جۆرە وەڵامێك کەبڕوای وایە ئێمە ئەو وەڵامانەمان دەوێت، بەڵام ئەوە سودی نیە، چونکە هیچ کەسێك دراوی ساختەی ناوێت).

کچی شۆفیرێك هەیە، پاش تێپەڕین بەئەزمونێکی سەختدا ئەوجا ئەو وانەیە فێربوو. زۆری هەوڵدا ببێتە گۆرانی بێژ.بەڵام ڕوخساری ببویە هۆکاری بەدبەختی بۆی. دەمی گەورە وددانەکانی بەرز بوون. کەبۆ یەکەمینجار لەبەردەم جەماوەردا گۆرانی گوت (لەیانەیەکی شەوانەی شاری نیوجرسیدا) هەوڵی ئەدا لچی سەرەوەی درێژبکاتەوە بۆ ئەوەی ددانەکانی پێ بشارێتەوە... هەوڵی ئەدا جوان بێت... ئەی ئەنجامەکەی چی بوو؟ خۆی وەك کەسێکی هیچ وپوچ نیشانداو خەریك بوو شکست بهێنێ.

بەڵام پیاوێ گوێی لەگۆرانیەکانی گرتبوو، هەستی کرد بوو ئەو کچە خاوەنی بەهرەیە. بۆیە پێی گوت: من چاودێری گۆرانیەکانم دەکردیت، هەستم کرد هەوڵ ئەدەیت چی بشاریتەوە، تۆ شەرم لەددانەکانت

دەکەیت!) کچەکە شەرمێکی زۆر دایگرت، وەڵێ پیاوەکە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی وگوتی: (چ ئەنگیەك لەوەدا هەیە؟ ئایا تاوانە ئەگەر ددانەکانت بەرزبن؟ هەوڵ مەدە ددانەکانت بشاریتەوە! دەمت بکەرەوە، ئەوجا دەبینیت جەماوەر پێت سەرسام دەبن، کەبت بینن هیچ شەرم ناکەیت. جگەلەوەش ڕەنگە ئەو ددانانەی کەدەتەوێت بیان شاریتەوە، ببنە بەخت بۆت!).

(کاس دایلی) کاری بەم ئامۆژگاریە کرد وهەموو شتێکی سەبارەت بەددانەکانی لەبیری خۆی بردەوە.لەوکاتەوە، بەتەنها بیری لەجەماوەرەکەی دەکردەوە. دەمی دەکردەوە وبەشادومانی گۆرانی دەگوت، لەئەنجامدا بویە یەکێك لەدرەوشاوەترین ئەستێرەکانی ڕادیۆ وتەلەفزیۆن و، ئێستاش ئەکتەرە کۆمیدیەکان هەوڵ ئەدەن لاسایی بکەنەوە!.

(ولیەم جیمس) ی بەناوبانگ، باسی لەو پیاوانە دەکرد کەهەرگیز ناتوانن خۆیان بدۆزنەوە کاتێ ڕای گەیاند: مرۆڤی ئاسایی زیاترلە(١٠٪) یتوانا هزریە شاردراوەکانی بەکار ناهێنێت... لەو ڕووەوە زیاتر دەدوێت ودەنوسێت: (بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی کەپێویستە وابین، ئێمە نیوە وەئاگاین، ئێمە تەنها بەشێکی کەم لەتوانا جەستەیی وفیکریەکانمان بەکار دێنین.

بەواتایەکی تر، مرۆڤ لەنێو سنورەکانیدا دەژی، کۆمەڵێ وزە وتوانای جۆراو جۆری هەیە، کەچی هەوڵ نادات بەکاریان بێنێت).

هەموومان ئەو توانایانەمان هەیە، دەی باهەوڵ بدەین هیچ چرپەکی تەمەنمان بەدوودڵی نەسپێرین، چونکە ئێمە وەکو خەڵکانی ترنین.تۆ

لەجیهاندا تازەیت، کەسێکی وەکو تۆهەرگیز لەجیهاندا دروست نەکراوە، بەهەمان شێوە، هەرگیز کەسێکی کتومت وەکو تۆ دووبارە لەسەر زەویدا دروست ناکرێتەوە. زانستی بۆماوەیی پێمان دەڵێت: تۆ لەئەنجامی یەکگرتنی بیست وچوار کرۆمۆسۆمی باوکت لەگەڵ بیست وچوار کرۆمۆسۆمی دایکتدا پێک هاتوین. ئەو چل وهەشت کرۆمۆسۆمە خەسڵەتە بۆماوەییەکانت دەست نیشان دەکەن. (ئەمرام سشاینفیلد) دەڵێت: (لەنێوان سەدان جیندا، تەنها یەك جین دەتوانێت ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت).

تەنانەت کاتێ دایك وباوکت پێکەوە جووت بوون، لەنێو (٣٠٠/٠٠٠ بلیۆن) هەڵدا، تەنها یەك هەل هەبوو بۆ ئەوەی تۆ لەدایك بیت!، بەواتایەکی تر: تۆلەوکاتەدا (٣٠٠/٠٠٠بلیۆن) خوشك وبرات هەبوو، ئەوان هەموویان لەتۆ جیابوون...

ئایا ئەم قسەیە تەنها مەزەندەکاریە؟ نەخێر، بەڵکو ڕاستیەکی زانستیە.

ئەگەر دەتەوێت لەبارەی ئەم بابەتەوە زیاتر بزانیت، کتێبی (تۆ وبۆماوە) ی‌دانراوی (ئەمرام سشاینفیلد) بخوێنەرەوە!.

من بەمتمانەوە باس لەمەسەلەی هەوڵدان دەکەم بۆ خۆنیشاندان وەك ئەوەی هەیت، چونکە هەستێکی قوڵم بەرانبەر مەسەلەکە هەیە، دەشزانم باس لەچی دەکەم، لەئەنجامی ئەزمونە بەنرخ وتاڵەکانمەوە فێربووم. بۆ نمونە: کەلەسەرەتاوە لەکێڵگەکانی گەنمە شامی لە(میسوری) دوە هاتمە شاری (نیویۆرك) پەیوەندیم کردبە (کۆلیژی ئەمریکی بۆ هونەرەکانی شانۆ) وە... زۆر هەوڵم ئەدا ببمە ئەکتەر. بیرۆکەیەکم هەبوو، خۆم پێم

وابوو بیرۆکەیەکی نایابە، وام دەزانی ڕێگەیەکی کورتە بۆ گەشتن بەسەرکەوتن، لێکۆڵینەوەم لەسەر ئەوە دەکرد کەچۆن ئەکتەرە ناودارەکانی وەك: (جۆن درو، واڵتر هامبدن، ئۆتیس سکین) گەشتونەتە ئامانجەکانیان. دواتر خەسڵەتە باشەکانیانم بەنەمری لای خۆم دەهێشتەوە... ئیدی خۆمم دەکردە ئەستێرەیەکی درەوشاوە... بەڵام هەموو ئەم بیرۆکەیەم شتێکی هیچ وپوچ بوو! بەڵکو پێویست بوو لەسەرم چەندساڵێکی تەمەنم بەلاسایی کردنەوە بگوزەرێنم، بەر لەوەی باشترین بیرۆکە بدۆزمە، بیرۆکەی ئەوەی کەپێویستە ببمە خۆم!وهەرگیز ناکرێت من ببمە کەسێکی تر.

ئەم ئەزمونە سەختە پێویست بوو، وانەیەکم فێربکات کەهەرگیز لەیاد نەچێت.بەڵام وانەبوو. من زۆر سەر سەخت بووم. بۆیە وای پێویست دەکرد وانەیەکی تریش فێرببم. پاش چەندساڵێك، خۆم ئامادەکرد بۆنوسینی پەڕاوێ کەخۆم وام بەخەیاڵدا دەهات، باشترین پەرتوك بێ کەسەبارەت بەهونەری وتاردان نوسرابێ وبۆ بزنسمانەکان تەرخانکرابێ... کەچی بۆ نوسینی ئەو پەرتوکەش پەنام بردەوەبەر هەمان بیرۆکە هیچ وپوچەکە: بڕیارمدا بیرۆکەی نوسەرانی تر وەربگرم ولەیەك کتێبدا کۆیان بکەمەوە، تاکو کتێبێ دەرچێت بیرو بۆ چونی زۆری تێدا کۆببێتەوە.ژمارەیەك کتێبی تایبەت بەبواری وتاردانم لەخۆم کۆکردەوە ویەکساڵی ڕەبەق سەرقاڵی ئەوە بووم بیرۆکەی نێو ئەو کتێبانە بە وشە تایبەتەکانی خۆم دابڕێژمەوە. کەچی دوایی هەستم کرد، من زۆر دەبەنگانە ڕەفتار دەکەم. چونکە ئەو تێکەڵە بیرۆکەیەی کارم لەسەر دەکرد لێکترازاو وناچونیەك بوون. تەنانەت یەك بزنسمان

تەماشای کارەکەمی نەکرد. بەو جۆرەش کۆششی یەک ساڵم خستە نێو سەبەتەی فەرامۆشکردنەوە، سەر لەنوێ دەستم بەکار کردەوە، بەخۆم دەگوت: (پێویستە دیل کارنگی بیت... دیل کارنگی بیت بەهەموو هەڵەو کەم وکووڕیەکانیەوە، بەهەموو سنور وبەربەستەکانیەوە، ناتوانیت کەسێکی تربیت) بەو شێوەیە دەست بەرداری ئەوە بووم کەببمە تێکەڵەیەک لەکۆمەڵێ پیاوی تر.بۆیە قۆڵم هەڵماڵی ودەستم بەو کارە کرد کەهەر لەسەرەتاوە دەبوا بمکردایە، پەرتوکێکم سەبارەت بەهونەری وتاردان نووسی، بیرۆکەکانی پەرتوکەکەم لەئەزمون وتێبینی وباوەڕەکانی خۆمەوە (وەک مامۆستاو وتاربێژێ) هەڵگۆستبوو. بەو پەندە فێربووم کە(سیروالتەر رالیە) فێری ببوو، ئەو دەڵێت: ( ناتوانم پەرتوکێ بنوسم شان بدات لەشانی نوسراوەکانی شکسپیر، بەڵکو دەتوانم پەرتوکێ بەگوێرەی پێنوسەکەی خۆم بنوسم)!.

هەوڵ بدە ببیتە خۆت، هەوڵ بدە کار بەو ئامۆژگاریە بکە کە(ئیرفینگ برلین) پێشکەشی (جۆج گیر شوین )ی کرد. کاتێ بۆیەکەمجار (برلین) و(گیرشوین) چاویان بەیەکتر کەوت.برلین بەناوبانگ بوو، لەبەرانبەردا (گیرشوین) نوسەرێکی تازە پیاکەوتووی لاوبوو، هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو لەهەفتەیەکدا سی وپێنج دۆلار بەدەست بێنێت لە(تین بان ئالی).برلین کەبەتواناکانی گیرشوین سەرسام ببوو، کارێکی بۆ دۆزیەوە بەسێ ئەوەندەی ئەو کرێیەی خۆی خوازیاری بوو، کارەکەش بریتی بوو لەکارکردن وەک سکرتێری مۆسیقی. بەڵام دواتر برلین لەم هەنگاوە پاشگەز بویەوە وئامۆژگاری شوینی کردوگوتی: (بەوکارە قایل مەبە، ئەگەر ئەو کارە بکەیت، لەوانەیە نوسەرێکی پلە دوو بمێنیتەوە، بەڵام

ئەگەر پێداگری بکەیت لەسەر ئەوەی خۆت بیت، ئەوا دەبیتە هونەرمەندێکی پلەیەك).

(گیرشوین) بەم ئاگادار کردنەوەیە قایل بوو، بۆیە زۆری نەبرد بویە بەناوبانگترین نوسەری ئەمریکی لەسەردەمەکەی خۆیدا.

هەریەك لە(شارلی شاپلن، ویل روجرز، ماری مارگریت، جینی ئوتری وملیۆنەهای تر) دەبوا ئەو پەندە فێر بوبان... هەر یەکێکیشان بگریت لەمیانەی ئەزمونی تاڵی تایبەتی خۆیەوە فێری ئەو وانەیە ببوو.

کاتێ شارلی شاپلن، دەستی بەدروستکردنی فیلم کرد، بەرهەم هێنەرەکە پێداگری ئەوەی لێدەکرد کەلاسایی هونەرمەندێکی کۆمیدی بەناوبانگی ئەوکاتەی ئەڵمانیا بکاتەوە.بەڵام شارلی شاپلن ئەوەی ڕەت دەکردەوە کەجگە لەخۆی ببێتە کەسێکی تر.(بۆب هوب)یش ئەزمونێکی هاوشێوەی هەیە: ئەمیش چەند ساڵێکی لەنمایشی ئیستیعرازیدا... بەسەر برد، کەچی هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا تائەوکاتەی دەستی کردە نمایش کردن بەکەسێتی خۆی.کاتێکیش ماری مارگریت دەستی بەکاری نواندن کرد، هەوڵیدا ببێتە ئەکتەرێکی کۆمیدی ئیرلەندی، لەم هەوڵەیدا شکستی هێنا. لەبەرانبەردا کاتێ ویستی ببێتە خۆی -ببێتەوە کچە لادێییە سادەکەی ناوچەی میسوری -بویە درەوشاوەترین ئەستێرەکانی ئیستگە لەنیویۆرکدا.

ئەو دەمەی (جینی ئوتری) هەوڵیدا واز لەشێوەزمانی تەکساس بهێنێ وجلی شاریەکانی لەبەرکرد وخۆی کردبوە خەڵکی نیویۆرك.خەڵك گاڵتەیان پێ دەکرد. وەلێ کاتێ دەستی کردە گۆرانی وتن. بەشێوەی شوانەکانی مانگا، پێی نایە ژیانێکی هونەری واوە، کەبویە بەناوبانگ

ترین دەنگ ورەنگی‌شوانەکانی مانگا... تۆ شتێکی تازەیت لەم جیهانەدا، بەوەش شادومان و دڵخۆش بە... .زۆربەی ئەوشتانە بەکار بێنە کەسروشت پێت دەبەخشێت، چونکە هونەر شتێکی خودیە. تۆ تەنها لەمیانەی خۆتەوە ستران دەبێژیت وهەر لەمیانەی خودی خۆشتەوە وێنەدەکێشیت.

پێویستە دەقاو دەق وەك ئەوە وابیت کەئەزمونەکانت، دەوروبەرت و، فاکتەرە بۆماوەییەکانت لێتیان دەوێت، پێویستە بەخۆت باخچە بچکۆلانەکەت بڕوێنیت، ئیدی باجەکەی هەرچی بێت. لەئۆرکسترای ژیانیشدا، بەئامێرە بچکۆلانەکەی خۆت مۆسیقا بژەنیت، ئیدی باجەکەی هەرچی بێت.

وەك (ئەلرسۆن) لەوتارەکەیدا (پشت بەخۆ بەستن) دەڵێت: (لەژیانی ڕۆشنبیری مرۆڤدا ماوەیەك هەیە، تیایدا دەگاتە ئەو بڕوایەی کەئیرەیی نەزانینە ولاساییش خۆکوشتنە، پێویستە لەسەری خۆی قبوڵ بکات بەخەسڵەت وتایبەتمەندیەکانیەوە. سەرباری ئەوەی گەردونی بەرین لێوانە لەشتی باش، ناتوانێت لەو بەرهەمە زیاتر بەدەست بێنێت کەلەزەویەکەی خۆیەوە چنگی دەکەوێت... ئەو هێزەکەی لەنێو ناخیدایە، شتێکی تازەیە لەسروشتدا، جگەلەخۆیشی هیچ کەسێکی ترنازانێت دەتوانیت بەو هێزەی چی بکات، خۆیشی نازانێت دەتوانێت چی بکات تاکو دەست بەهەوڵدان نەکات).

ئەمە پوختەی ئەو شێوازەیە کەئەمرسۆن تیایدا دەربڕلە پشت بەخۆ بەستن دەکات. بەڵام لێرەکانەدا میکانیزمێکی هۆزانڤانانە هەیەکە (دۆگلاس مالوتچ) دەربڕی لێدەکات ودەڵێت:

ئەگەر ئەت توانی ببیتە دار سنەوبەرێك بەسەرلوتكەی تەپۆلكەیەكەوە
ببەرە دەوەنی نێو دۆڵێك
ببەرە باشترین دەوەنی تەنیشتی چەشمەیەك.
ببەرە دەوەن، ئەگەر نەتوانی ببیتە دەوەن، ببە بەگژوگیا.
ڕێگەكە برازێنەوە
ناتوانین هەموو مان ببینە سەركردە،
بەڵكودەتوانین ببینە دەریاوان
هەركەسەوكارێكی هەیە
كارێكی گەورە هەیەو كارێكی كەمتریش هەیە پێویستە ڕایان بپەڕێنین
ئەبێ ئەو ئەركەی لەسەر ئەستۆمانە، جێبەجێی بكەین. باهەوڵ بدەین
لاسایی كەسانی تر نەكەینەوە، تاكو خۆمان بدۆزینەوە...
ئەگەر نەتتوانی ببیتە شاڕێ،
ببەرە تولەڕێیەك
گەر نەتتوانی ببیتە خۆر،
ببەرە ئەستێرە.

# بەشی دووەم

## چوار نەریت کەلەکاتی کارکردندا یارمەتیت دەدەن بۆ دوور کەوتنەوە لەشەکەتی ودوو دڵی

**نەریتی ژمارە١:** نوسینگەکەت پاك بکەرەوە لەهەر پەڕەو کاغەزێك، جگە لەو کاغەزو نوسراوانەی کەپەیوەندیان بەکاری ئێستاتەوە هەیە.

(ڕۆلاندل ولیمس) سەرۆکی هێڵی ئاسنی شیکاگۆ وباکوری ڕۆژهەڵات، دەڵێت: (مرۆۆ کاتێ لەنوسینگەیەکی پڕلەکاغەزو نوسراوی هەمەچەشندا دادەنیشێت، هەست دەکات کارەکەی زۆر ئاسان دەبێت گەرپێتو نوسینگەکەی پاك بکاتەوە لەهەر نوسراو وکاغەزێکی زیادە، جگە لەو نوسراوانەی کەپەیوەندییان بەکارەهەنوکەییەکەیەوە هەیە... ئەوە ناو دەنێم ڕێکوپێکیەکی باش لەماڵدا، یەکەمین هەنگاویشە بەرەو کارا بوون وسەرکەوتن. هەر میوانێك سەردانی کتێبخانەی کۆنگریس دەکات لە(واشنتۆن د.س)، پێنج وشەی بەر چاو دەکەوێت کەبە بانی کتێبخانەکەوە نوسراون، وشەکان لەلایەن هۆزانڤان (بوب pope) ەوە نوسراون، ئەویش ئەو ڕستەیەکە دەڵێت: (ڕێك وپێکی یەکەمین یاسای ئاسمانە).

پێویستە لەکارکردنیشدا ڕێکوپێکی وڕژێم یەکەمین یاسا بێت، بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟ نەخێر، چونکە نوسینگەی هەربزنسمانێکی ئاسایی بگری، پڕەلە چەندین نوسراو کەماوەی چەند هەفتەیەك بەسەریاندا گوزەری کردوە وهێشتر سەیری نەکردوون.لەڕاستیدا، سەرنوسەری ڕۆژنامەیەك لە(نیوئۆرلیانز) باسی ئەوەی بۆ کردم کەکاتێ سکرتێرەکەی نوسینگەکەیی بۆ ڕێکخستۆتەوە، ئامێرێکی چاپکردنی تێدا دۆزیوەتەوە کەماوەی دووساڵ بزر ببوو!.

بەتەنها دیمەنی نوسینگەیەکی شپرز، کەپڕبێت لەنامەی وەڵام نەدراوە وڕاپۆرت ویادخەرەوەی زۆر، بەسەبۆ دروست بوونی ڕاڕایی وبێتاقەتی وقەڵسی ودوو دڵی.مەسەلەکە تەنها بەوەشەوە ناوەستێت. چونکە بینینی ئەو هەموو کاغەزە کەڵەکە بوانە، وەبیرت دێننەوە کەکاری زۆرت لەپێشە، کەچی دەرفەتی تەواویشت نیە بۆ جێبەجێکردنیان (ئەمەش نیگەران وقەڵست دەکات وتەنها دووچاری شەکەت بونت ناکات، بەڵکو دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی فشاری خوێن ونەخۆشینەکانی دڵ وبرینی گەدە).

د.کتۆر(جۆن.هـ.ستۆکس) مامۆستای دەرچووی پەیمانگای پزیشکیە لەزانکۆی پەنسلڤانیا، لەبەردەم کۆنگرەی نیشتمانی پزیشکی ئەمریکیدا، لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش کرد بەناوی: (گرژیە دەماریە کرداریەکان، وەك ئاسەواری نەخۆشیە جەستەییەکان).لەم لێکۆڵینەوەیەدا.دکتۆر ستۆکس لیستێکی لەیانزە حاڵەتدا نوسیوە لەژێرناوی: (لەحاڵەتی نەخۆشینی دەرونیدا، پێویستە بەدوای چیدا بگەڕێیت)... لەبڕگەی یەکەمی ئەو لیستەدا دەڵێت: (هەست کردن

بەبەرپرسیارێتی یان ئەرك، درێژبونەوەی بێ کۆتایی ئەو شتانەش کەپێویستە جێ بەجێ بکرێن).

بەڵام چۆن چۆنی کردارێکی سادەو ساکاری وەك ڕێك وپێك کردنی نوسینگەکەت، یارمەتیت دەدات لەدوورکەوتنەوە لەفشاری بەرزی خوێن وهەست کردن بەپەیگیری ودرێژبونەوەی بێ کۆتایی کارەکان؟ ...

دکتۆر(ولیەم .سدلەر) پزیشکی دەروونناسی بەناوبانگ، باسی نەخۆشێکمان بۆدەکات کەلەڕێی بەکارهێنانی ئەو شێوازەوە توانی بەربگرێت بە(داڕوخانی دەماریی).

ئەم نەخۆشە بەڕێوەبەری یەکێك لەکۆمپانیا گەورەکانی شیکاگۆبوو، کاتێ سەردانی عەیادەکەی(دکتۆر سدلر)ی کرد، زۆر ڕاڕاو توڕە ودوو دڵ بوو، هەستی دەکرد خەریکە بەتەواوی دادەڕوخێت، لەهەمان کاتدا هەستی دەکرد ناتوانێت دەست بەرداری کارەکەی بێت، بۆیە پێویستی بەهاوکاری دکتۆر هەبوو.

(دکتۆر سدلەر) دەڵێت: کاتێ پیاوەکە باسی چیرۆکەکەی بۆ کردم، زەنگی تەلەفۆن لەنەخۆشخانەوە لێیدا، لەبری ئەوەی مەسەلەکە دوابخەم، کاتەکەم قۆستەوە بۆئەوەی بگەمەبڕیاری گونجاو.چونکە من هەمیشە مەسەلەکان بەخێرایی چارەسەر دەکەم.هێندەی نەبرد بۆ جاری دووەم زەنگی تەلەفۆن لێیدایەوە، جاری سێیەم کارەکە زۆر بەپەلە بوو، دەبوا ماوەیەك تەرخان بکەم بۆ تاوتوێ کردنی... سێیەمین ناوبڕ بەهۆی ئەوە وەبوو کەهاوڕێیەکم هات بۆ نوسینگەکەم بۆ پرسیارکردن لەبارەی بارودۆخی نەخۆشێکەوە، کاتێ لەگەڵ ئەویشدا کۆتایم بەقسەوباسەکانم هێنا، ئاوڕم دایەوە بەلای نەخۆشەکەمدا وداوای لێبوردنم لێکرد

کەبۆماوەیـــەك فەرامۆشـــم کــــردوە، کەچـــیئەو زۆر چوســـت بـــوو، بەڕوخساریەوە ئەدگاری جیاواز دەبینـرا) پێمـی گـوت: (دکتـۆر گیان داوای لێبوردن مەکە!لەم (دە)خولەکەی دوایدا.هۆکاری نەخۆشینەکەی خۆمم بۆ دەرکەوت.دەگەڕێمەوە بۆ نوسینگەکەم ونەگەڕێمەوە بەسەر نەریتەکانم لەکارکردندا... بەڵام بەر لەوەی بڕۆم ڕێگەم ئەدەیت چاوێك بەنوسینگەکەتدا بگێڕم؟ ).

دکتۆر درگاکانی نوسینگەکەی بۆ دەکاتـەوە، هـەموو ژورەکـان خاڵی بوون تەنها کەل وپەلە پێویستیەکانیان تێدابوو.بۆیە نەخۆشەکە گوتی: (پێم بڵێ، لەکوێتایدا ئەو کارانە هەڵدەگریت کەجێ بەجێت نەکردوون؟ ).

-سدلەر گوتی: (بەجێبەجێ کراوی هەڵیان دەگرم)!.

(ئەی لەکوێندەر ئەو نامانە هەڵدەگریت کەوەڵامت نەداونەتەوە؟ )

-(هەمویان وەڵام دەدەمەوە ئەوجا هەڵیان دەگرم، یاسای من لەژیاندا ئەوەیـە هـیچ نامەیـەك بەرلـە وەڵامدانـەوە هەڵنـەگرم، دەسـت بـەجی وەڵامەکانیان دەدەمە سکرتێرەکەم).

لەپاش شەش هەفتە، هەمان بەڕێوەبەر داوەتی دکتۆر سدلەری کرد تاکوسەردانی نوسینگەکەی بکات، ئەو لەدوای تێپەڕینی شەش هەفتە ببویـە مرۆڤێکـی نـوێ.هـەروەها نوسینگەکەیـشی گۆڕابـوو، درگـای ژورەکانی بۆ والأکرد، تاکو پیشانی بدات کەنوسینگەکەی ئەمیش خاڵیە لەهەر جۆرە کارێکی ئەنجام نەدراو.

ئینجا گوتی: (بەر لەشەش هەفتە، سێ دانە نوسینگەم هەبوو لەناو دوو ژوردا، پڕبوون لەکاری ئـەنجام نـەدراو، بـەڵام دوای ئـەوەی قسەم لەگەڵ تۆدا کرد، کەهاتمەوە باری یەك گەڵابە ڕاپۆرت ونوسراوی کۆنم

جێبەجێ کرد. ئێستاش تەنها لەیەك نوسینگەدا کاردەکەم، هەر داواکاریەکیشم پێ بگات، دەست بەجێ ڕای دەپەڕێنم، پشت گوێیان ناخەم تالەدوایدا بۆم نەبنە مایەی دوو دڵی وشڵەژان)... وەلێ ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کەبەتەواوی چاك بومەتەوە، وەك دەمبینی ئێستا زۆر ساغڵەمم وتەندروستیم باشە!).

(چارلز ئیڤنس هیوز) سەرۆکی دادگای باڵای وڵاتەیەکگرتوەکان دەڵێت: (مرۆڤ بەهۆی کاری سەختەوە نامرێ، بەڵکو بەهۆی پەرتەوازەیی ودوو دڵیەوە دەمرێ). بەڵێ، بەهۆی پەرتەوازە بوونی وزە وتواناکانیان و دوودڵیەوە، دەمرن، چونکە بەو حاڵەوە هەرگیز ناتوانن کارەکانیان ڕاپەڕێنن.

**نەریتی ژمارە٢:** بەگوێرەی گرنگییان، کارەکان ڕاپەڕێنە (هنری ل.دوهرتی) دامەزرێنەری کۆمپانیای (سیتز سرڤیس) دەڵێت: بری ئەو کرێیە هەرچەندەبێ کەدەدرێت، دوو توانا هەیە ئەستەمە بەدەست بهێنرێن.

ئەو دوو توانایەش کەبە پارەو پول مەزەندەناکرێن، بریتین لە: یەکەم، توانای بیرکردنەوە، دووەم، توانای هەستان بەڕاپەڕاندنی کارەکان بەگوێرەی بایەخ وگرنگییان.

چارلز لۆکمان، ئەو گەنجەی کە لە داڕوخانەوە دەستی پێکردو لەدوای دوانزەساڵ بویە سەرۆکی کۆمپانیای (ببسودوانت)، دواتر لەماوەی ساڵێکدا سەدهەزار دۆلار داهاتی دەست دەکەوت، ئەمە سەرباری کۆکردنەوەی یەك ملیۆن دۆلار. ئەم لاوەش دەڵێت، زۆرینەی سەرکەوتنەکانم دەگەڕێتەوە بۆ گەشەپێدانی ئەو دوو توانایەی کە(هنری

دوهرتی) پێی وایە ئەستەمە بەدەست بهێنرێن... چارلز لۆکمان هەروەها دەڵێت: (شتێ کەزیاترلە یادەوەریمدا مابێتەوە، ئەوەیە کەهەمیش کاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو ڕادەبووم، چونکە لەوکاتەدا، پتر لەهەر کاتێکی تر دەتوانم بیرکەمەوە.دەتوانم باشتر بیرکەمەوە وپلان بۆ سەرتاسەری ئەو ڕۆژەم دابنێم وهەروەها پلانیش بۆئەوە دابنێم کەبەگوێرەی بایەخی شتەکان جێبەجێیان بکەم).

(فرانگ باتگر) یەکێك لەهەرە کاراترین کەسایەتیەکانی بواری بیمەدان ودڵنیایی، چاوەڕوان ناکات تاکو کاتژمێر پێنجی بەیانی، بەڵکو هەر شەو پلانی ڕۆژی داهاتوو دادەنێت.

من لەئەنجامی ئەزمونی دوورو درێژمدا، بۆم دەرکەوتووە کەمرۆڤ ناتوانێت بەهەمیشەیی کارەکانی بەگوێرەی گرنگییان جێ بەجێ بکات، وەلێ دەشزانم کەهەر بوونی نەخشە بۆ جێبەجێ کردنی کارەگرنگەکان باشترە ویارمەتیت دەدات تاکوبە سانایی ئەرکەکانت ڕاپەڕێنیت.

ئەگەر جۆرج بەرنادشۆ، کاری بەم ڕێسایە نەکردایە، ڕەنگە وەك نوسەرێك شکستی بهێنایە وبەدرێژایی ژیانی کرێکاری بانك بوایە.

بەرنادشۆ پلانی هەبوو کەبەدرێژایی نۆساڵ ڕۆژانە پێنج لاپەڕە بنوسێت، هەرچەندە بەدرێژایی ئەو ماوەیە تەنها سێی دۆلار دەستکەوتی هەبوو (واتە نزیکەی یەك میلم لەڕۆژێکدا)!..ڕۆبنسۆن کروزو، تەنانەت پلان ونەخشەی دارشتوە بۆ هەرکاتژمێرێك لەکاتژمێرەکانی کارکردنی ڕۆژانەی.

ئەریتی ژمارە۲: هەر گرفتێك ڕوبەڕوت بویەوە، دەست بەجێ چارەسەری بکە، ئەگەر ڕاستیە پێویستیەکانی دەرکردنی بڕیارت لابوو، هەرگیز

پرۆسەی بڕیاردان دوامەخە. یەکێك لەقوتابییە کۆنەکانم بەناوی (هـ.ب.هـول) باسی ئەوەی بۆ کردم، کاتێ ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیای پۆڵای ئەمریکا دەبێت ، کۆبونەوە بۆچارەسەرکردنی گرفتە ئاڵۆزەکان دەبەستران، لەوکاتەشدا ئەیان نەتوانی بگەنە بڕیاردان سەبارەت بەو گرفتانە مەگەر کەمێکی زۆر کەم نەبێت.

ئەی سەرەنجام چی بوو؟ دەبوو هەر ئەندامێکی ئەنجومەن باوەشێك ڕاپۆرت بباتەوە ماڵەوە ولێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکات.

دواجار بەڕێز (هول) قەناعەتی بەئەنجومەنەکە کرد تاکو یەك یەك بابەتەکان تاوتوێ بکرێن.بەم شێوەیە ئەدواخستن ڕودەدات ونەپشێوی... چونکە هەرچۆن بێت پێویستە بگەنە بڕیاردان لەبارەی گرفتێکەوە، ئەوجا بگوازنەوە سەر گرفتێکی تر.بەڕێز(هول) گوتی سەرەنجامی ئەم پێشنیارە سەرسامکەر بوو، چونکە توانرا زۆر بەئاسانی چارەسەری هەموو گرفتەکان بکرێت، ئیدی پێویست نەبوو هەر ئەندامێك باوەشێ ڕاپۆرت لەگەڵ خۆیدا بباتەوە بۆماڵەوە. ئەو دڵە ڕاوکێیەش لەئارادا نەما کەپێشتر بەهۆی چارەسەر نەکرانی گرفتەکانەوە دروست دەبوو.

ئەم ڕێسایە تەنها بۆ ئەنجومەنی بەڕێوەبەران گونجاو نیە، بەڵکو بۆمنیش وتۆش گونجاوە.

ئەریتی ژمارە٤: - بزانە چۆن کارەکان ڕێکدەخەیت وبەڕێوەیان دەبەیت. زۆر جار بزنسمانێك خۆی بەرەو ناو گۆڕ دەنێرێت بەر لەوەی کاتی مردنیشی بێت، هۆکاری ئەم مردنە ناوەختەش ئەوەیەکە نەیزانیوە

چۆن بەرپرسیارێتیەکان دەسپێرێت بەکەسانی تر، تەنانەت پێداگریش دەکات لەسەر ئەوەی بەتەنها خۆی هەموو کارەکان ڕاپەڕێنێت.ئەنجامی ئەمەش ئەوەیە کەپشێوی وبێ سەرو بەری ڕوی تێدەکات وشەکەت وماندوو دەبێت... هەمیشە هەست بەدوو دلّی وڕاڕایی دەکات... من دەزانم ئەرك سپاردن بەبەرانبەرەکانت، کارێکی سەختە.چونکە خۆم بەلامەوە زۆر سەخت بوو.هەروەها لەئەنجامی ئەزمونەکانیشمەوە دەزانم کەچ کارەساتێك دەقەومێ ئەگەر بەرپرسیارێتی بدرێتە دەستی کەسانی ناشایستە.لەگەلّ ئەوەشدا، پێویستە بەڕێوەبەر ئەو کارە بکات تاکو خۆی دوور بخاتەوە لەدوو دلّی وڕاڕایی وشەکەتی.

ئەو پیاوەی کارێکی گەورە دادەمەزرێنێت ودواتر نازانێت چۆن چۆنی ڕێکی بخات وبەڕێوەی بەرێت، سەرەنجام لەتەمەنی پەنجاکاندا یان لەسەرەتای شەستەکانی تەمەنیدا، توشی نەخۆشینی دلّ دەبێت.نەخۆشینی دلّ هۆیەکەی بریتیە لەڕاڕایی ودوو دلّی.

ئایا دەتەوێت لەم ڕوەوە نمونەیەکی دیاریکراوت بۆ بهێنمەوە؟ بفەرموو لاپەڕەی تایبەت بە(مردنی نەخۆشەکان) لەڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا بخوێنەرەوە.

# بەشی سێیەم

## چ شتێ هیلاکت دەکات؟

## چیت پێ دەکرێ لەئافاریدا ؟

لێرەکانە، ڕاستیەکی پڕبایەخ هەیە دەڵێت: بەتەنها کاری هزری نابێتە هۆی ماندوبونت.ڕەنگە ئەم قسەیە بەهیچ وپوچ بێتە بەرچاو.وەلێ چەند ساڵێك لەمەوبەر، زاناکان هەوڵیاندا بزانن ماوەی چەند هزری مرۆڤ دەتوانێت کاربکات، بێ ئەوەی بگاتە(وزەی کەمکردوی کار)، پێناسەی زانستی شەکەتی ئەو دێڕەی ناو دووکەوانەکەیە.دواجار زاناکان گەشتنە ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەر، ئەویش ئەوە بوو کەبۆیان دەرکەوت ئەو خوێنەی بەمێشکدا دەڕوات لەکاتی کارکردن وچالاکیدا، هەرگیز نابێـە هۆی هیلاك بوون.

ئەگەر دڵۆپی خوێنی کرێکارێ وەربگریت لەکاتی کارکردنیدا ولەئەزمایشگاشیکاری بۆ بکەیت، دەبینیت پڕە لەمیکرۆبی شەکەتی وئاسەوارەکانی هیلاکی.بەڵام ئەگەر لەکۆتایی ڕۆژیشدا دڵۆپێ خوێنی (ئەلبێرت ئەنیشتاین) وەربگریت و لەتاقیگە لێی بنواڕیت دەبینیت هیچ جۆرە میکرۆبێکی هیلاك بوونی تێدا نیە.

هەرچی مێشکیشە، دەتوانێ بەو پەڕی چوست وچالاکی وبەخێرایی کاری خۆی بکات، تەنانەت لەپاش هەشت یان دوانزە کاتژمێر کارکردنی بەردەوامیش.وەك چۆن لەسەرەتادا کاری کردووە. مێشك هەرگیز هیلاك نابێت... کەواتە تۆ چی هیلاکت دەکات؟ .

نۆژدارانی دەروونناسی پێیان وایە زۆرینەی شەکەتیەکانمان بەهۆی هەڵوێستە فیکری وسۆزداریەکانمانەوەیە... (ج.ا.هارفێلد) بەناو بانگترین پزیشکی دەروونناس لەئینگلتەرا، لەپەرتوکەکەیدا (دەروونناسی هێز) دەڵێت: (سەرچاوەی بەشی زۆری ئەو هیلاکیەی هەستی پێ دەکەین بریتیە لەمێشك، لەڕاستیدا، ئەو هیلاکیەی کەهۆیەکی جەستەیی هەیە، شتێکی زۆر دەگمەنە).

پزیشکی بەناوبانگی ئەمریکایی(ا.بریل) پتر لەو سنورەش دەڕوات ودەڵێت: (لەسەداسەد، هیلاك بوونی کرێکارێکی ساغڵەم، دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە دەرونیەکان، مەبەستمان لەهۆکارە سۆزداریەکانە).

کەوابێ ئایا ئەو هۆکارە سۆزداریانە کامانەن کەکرێکارێکی ساغڵەم ماندوو دەکەن؟ خۆشحاڵی؟ حەسانەوە؟ پشودان؟ نەخێر! هەرگیز!... بێ ئومێدی ورەش بینی وهەست کردن بەوەی بەرانبەرەکانی ڕێزی ناگرن، هەست کردن بەوەی دژایەتی دەکرێ، دوو دڵی... هتد، ئەمانە ئەو هۆکارە سۆزداریانەن کەکرێکار شەکەت دەکەن وبەرهەمی کەم دەکەنەوە وبەژانە سەرەوە دەیگێڕنەوە بۆماڵەوە... بەم جۆرە، ئێمە هیلاك دەبین، چونکە هەستەکانمان دەبێتە هۆی گرژبوونی دەمارەکانمان وشەکەتی جەستەمان.

كۆمپانیای (میترپۆلیتان)ی تایبەت بەدڵنیایی، لەنامیلكەیەكدا ئامارە بەمەسەلەكانی تایبەت بەشەكەتی دەكات ودەڵێت: (كاری ناڕەحەتیش، زۆر بەدەگمەن دەبێتە هۆی شەكەتیەكی واكە بەنوسین وپشودانیش چارەسەری نەكرێ... دوو دڵی وڕاڕایی وپشێوی سۆزداری، هۆكاری سەرەكی شەكەت بونن.نەكاری جەستەیی هۆكاری هیلاكیەو نەكاری هزری... ).

لەم چركەساتەدا چاودێریەكی وردی خۆت بكە، كاتێ ئەم چەند دێڕە دەخوێنیتەوە، ئایا هەست بەشڵەژان وڕاڕایی دەكەیت؟ یاخود بەشێوەیەكی ڕەحەت لەسەر كورسیەكەت دادەنیشیت؟ ئایا شانت بەرز دەكەیتەوە؟ یان دەموچاوت گرژە؟ ئەگەر هەموو جەستەت لەم كات وساتەدا وەكو پارچە قوماشێك ڕەهاو بێ گرێ وگۆڵ نیە.ئەوا تۆلەم كاتەدا گرژی دەماری وگرژی ماسولكەكانت هەیەو دەمارەكانت هیلاك وشەكەت دەكەیت!.

بۆچی ئەم جۆرە گرژیانە بۆ خۆمان دروست دەكەین لەكاتێكدا كارێكی هزری ڕادەپەڕێنین؟

جۆلسین دەڵێت: (پێم وایە ئاستەنگی سەرەكی ... بریتیە لەو بڕوا باوەی كەدەڵێت: كاری ناڕەحەت پێویستی بەهەستكردن بەكۆشش هەیە، دەنا بەشێوەیەكی باش ڕاناپەڕێنرێ)... بۆیە ئێمە لەكاتی بیركردنەوەدا وانیشان دەدەین كە ئەركێ ڕادەپەڕێنین، ئەمەش هەرگیز هاوكاری مێشك ناكات.لێرەدا ڕاستیەكی حەسرەتامێزی سەرسوڕهێنەر هەیە: ملیۆنەها كەس لەوانەیە حەزبە لەدەستدانی پارەو سامان ناكەن، ڕوو دەكەنە بەفیڕۆدانی ووزە وتواناكانیان، بەشێوەیەكی وا بێ

موبالاتانـه، کـەبی موبالاتیەکـەیان یەکـسانە بـەبێ موبـالاتی حـەوت دەریاوانی سەرخۆش لەسینگافۆرەدا!!.

کەواتە ئایا وەڵامی ئەم هیلاك بوونە دەماریە چیە.گوشادی!فێربە هەمیشە لەکاتی کارکردندا گوشادبە.

بـەڵام ئایـا ئـەم گوشـاد بوونـە، ئاسـانە؟ نـەخێر.چـونکە لەوانەیـە واپێویـست بکـات نەریتـەکانی ژیانـت وازگـون بکـەیتـەوە.وەڵێ مەسـەلەکە شایستەی ئەم کۆششە گەورەیەیە، چونکە ڕەنگە ژیانت ڕزگار بکات! ولیەم جیمس لەوتارەکەیدا دەڵێت: (پەیامی گوشادی)بریتییە لەوەی (ڕاڕایی‌و پـشێوی‌و ... لای تـاکی ئـەمریکی ، نـەریتێکی ناپەسـەندە) شـڵەژان نەریتـە . گوشـادیش نەریتـە . دەکـرێ نەریتـە خـراپ و ناپەسەندەکان بگۆڕن بە نەریتە باشەکان.

چۆن گوشاد دەبیت ؟ ئایا بە مێشکت دەست پێ دەکەیت یاخود بە دەمارەکانت ؟ نابێ بەهیچکام لـەو دووانـە دەسـت پـێ بکـەیت.بـەڵکو پێویستە بەماسولکەکانت دەست پێ بکەیت.

لێگەڕێ هەوڵی ئەوە بدەین.باوای دابنێین لەچاوەکانتەوە دەست پێ دەکەین.

ئەم پەرەگرافە بەوردی بخوێنەرەوە، کاتێ تەواو بویت، پاڵ بدەرەوە وچاوت دابخە وزۆر بەهێوری بەهەر دوو چاوت بڵێ (بەسە شڵەژان، بەسە شڵەژان، گوشادبن) چەندجارێك بۆ ماوەی یەك خولەك ئەم نیوە دێرە بەهێوری دووبارە بکەرەوە.

پاش چەند چرکەیەك، ئایا هەست ناکەیت ماسولکەکانی چاوت گوشادبوون؟ ئایا هەست بەوە ناکەیت دەستێك شڵەژان وگرژیەکەی لەسەر سڕیونەتەوە؟ .

زۆر باشە، وادیارە ئەمەماقوڵ نیە، تۆ ئەوەت لەماوەی خولەکێکدا کردوو ئاشنابوویت بەکلیلی نهێنی هونەری گوشاد بوون.دەتوانیت هەمان کردار لەگەڵ ماسولکەکانی شەویلگەکان وڕوخسار ومل وهەر دووشان وهەموو جەستەشتدا بکەیت. بەڵام چاو هەرە گرنگترینی ئەندامەکانە .دکتۆر( ئەدمۆن جاکۆبسۆن) لەزانکۆی شیکاگۆ، دەڵێت: (ئەگەر بتوانیت ماسولکەکانی چاوت گوشاد بکەیت، دەتوانیت هەموو هیلاکیەکانی جەستەت لەبیر بکەیت) هۆکاری ئەم گرنگیەی چاوەکانیش لەلابردنی گرژی وشڵەژاوی دەمارەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە(هەردوو چاو) چواریەکی ئەو دەمارە وزەیە بەکار دەهێنن کەهەموو لەش بەکاری دەبات.لەبەر هەمان هۆکاریش ئەوانەی خاوەنی سەرنجێکی باشن، ئالودەن بەدەست(شڵەژان وگرژی چاوەکان)ەوە.

(فیکی بوم)ی ڕۆماننوسی بەناوبانگ، دەگێڕێتەوە لەکاتێکدا منداڵ بووە، چاوی بەپیرە پیاوێك کەوتوە، ئەو پیرەپیاوە گرنگترین وانەی لەژیانیدا فێرکردووە...

بەمنداڵی کەوتوە وئەژنۆی بریندار بووە، پیاوە پیرەکە بەرزی دەکاتەوە وتەپ وتۆزەکەی دەتەکێنێت، ئینجا پێی دەڵێت: (هۆی بریندار بونت ئەوەیەکە تۆ نازانیت چۆن گوشاد دەبیت.پێویستە وانیشان بدەیت کەوەکو گۆرەویەکی کۆن گوشادیت، وەرە باپیشانت بدەم چۆن چۆنی فێری ئەوە دەبیت).

ئەم پیاوەپیرە هەمیشە پێداگربوو لەسەر ئەوەی کەدەیگوت: (وابیرلەخۆت بکەرەوە کەگۆرەویەکی کۆنیت، پێویستە بەهەمیشەیی گوشاد بیت). دەتوانیت لەکاتەکانی دەست بەتاڵیتدا گوشاد بیت، گوشاد بوون یانی نەبوونی هیچ جۆرە ڕاڕایی وشڵەژان وکۆششێك. بەهێمنی وگوشادی بیربکەرەوە... بەبیرکردنەوە لەگوشاد کردنی ماسولکەکانی چاوت وڕوخسارت دەست پێ بکەو هەمیشە بێژە: بابە گوشادی دەست پێ بکەین... ).

هەست بکە بەو وزەیەی کەلەماسولکەکانی ڕوخسارتەوە دادەبەزێتە ناوەڕاستی سینگت، وابیر لەخۆت بکەرەوە کەوەکو منداڵ ڕزگار بویت لەگرژی وشڵەژان.

(گالی کورسی) گۆرانیبێژی گەورەی ئۆپێرا، لەسەر هەمان کردار نەریتی گرتبوو. (هیلین جبسۆن) باسی ئەوەی بۆ کردم کەهەمیشە(گالی) بەرلەوەی گۆرانی بڵێت، لەسەر کورسی دادەنیشت وهەموو ماسولکەکانی وشەویلگەی خوارەوەی گوشاد دەکرد. ئەمە مەشقێکی نایابە. چونکە دەبوە هۆی ئەوەی بەرلەوەی بچێتە سەر تەختەی شانۆ، هیچ گرژیەك لەدەمارەکانیدا نەمێنێت، لەئەنجامیشدا دوور دەکەوتەوە لەشەکەت بوون.

ئەم پێنج پێشنیارەی خوارەوە، یارمەتی گوشاد بونت دەدەن:

کتێبی (ڕزگار بوون لەگرژی دەمارەکان) دانراوی دکتۆر(دیڤید هارۆلد فینك) بخوێنەرەوە کەیەکێکە لەکتێبە هەر بەناوبانگەکانی ئەم بوارە.

لەساتەکانی بێ ئیشیدا گوشادبە، لێگەڕێ لەشت بەتەواوی گوشاد بێت، ئایا پشیلەت بینیوە کەلەبەر هەتاودا دەخەوێت؟ لەو دەمەدا گوربە

وەکو لاپەڕەیەکی تەڕکراو شل بوە لەبەر هەتاوەکەدا... تەنانەت یۆگاییەکانیش (ئەوانەی یاری یۆگادەکەن) لەهندستان، دەڵێن: ئەگەر دەتەوێت هونەری گوشاد بوون بەباشی فێربیت، ئەوا تەماشای پشیلە بکە.من هەرگیز پشیلەی ماندووم نەدیوە.یان پشیلەیەکم نەدیوە دوو چاری داڕوخانی دەماری یان نەخۆشینی دەرونی ودوو دڵی وزامی گەدە ببێت، ئەگەر فێر ببیت پشیلە چۆن خۆی شل وپەت وگوشاد دەکات، تۆش وابکەیت، لەوانەیە لەهەموو ئەو نەخۆشیانە خۆت دوور بخەیتەوە.

لەبارێکی خۆش وگونجاو وڕەحەتدا کاربکە، لەبیرت بێت گرژی وناڕەحەتی جەستە، دەبێتە هۆی ئازاری شان و، شەکەتی دەمارەکان.

لەڕۆژێکدا چوار تاپێنج جار خۆت بپشکنە، بەخۆت بڵێ: ئایا کارەکەم واڵ بکەم زیاتر شەکەتم بکات؟ ئایا ئەو ماسولکانەش بەکار بێنم کەهیچ پەیوەندیەکیان بەکارەکەمەوە نیە؟ ئەم کردارەش یارمەتیت دەدات بۆ دروست بوونی نەریتی گوشاد بوون.

جارێکی ترلەکۆتایی ڕۆژدا بەم پرسیارە خۆت تاقی بکەرەوە: (ئایا ماندووم؟ ئەگەر ماندووبویت. دڵنیابە بەهۆی ئەو ئەرکە هزریەوە نیە کەجێبەجێت کردووە، بەڵکو بەهۆی ئەو شێوازەوە کەلەجێبەجێکردنی کارەکەدا پێڕەوت کردووە).

دکتۆر(دانیاڵ و.جۆسلین) دەڵێت: (لەکۆتایی ڕۆژدابڕی دەستکەوتەکانم بەبڕی هیلاك بوونم ناپێوم، بەڵکو بەڕادەی هەست نەکردنم بەشەکەتی دەیپێوم.هەرجارێ لەکۆتایی ڕۆژدا هەست بەماندوێتی بکەم، یاخود هەرکاتێ هەست بەهیلاکی دەمارەکانم بکەم،

تێ دەگەم ئەو ڕۆژەی گوزەراندومە، کارا نەبووە لەڕووی چەندێتی وچۆنێتیەوە).

ئەگەر هەموو بزنسمانەکان لەئەمریکادا ئەم وانەیە فێربوبا ئەوا ڕێژەی ئەو مردانانە کەم دەبویەوە کەبەهۆی ڕاڕایی زیاد لە سنورەوە ڕودەدەن... هەروەها ئێمەش دەستمان کۆتا دەکرد لەپڕکردنی شێتخانەو زیندانەکانمان لەو پیاوانەی کەشەکەتی ودوو دڵی چۆکی پێداداون ولەناوی بردوون.

# بەشی چوارەم

## چۆن ئەو دڕدۆنگیە لاوە دەنێیت، کەدەبێتە هۆی شەکەتی ودوو دڵی وبێ ئومێدی

یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکانی شەکەت بوون، بریتیە لەڕەش بینی.بابۆ نمونەی ئەم قسەیە خاتوو(ئەلیس)ی نوسەر وەرگرین... ئەم خاتوونە نوسەرە ڕۆژێك گەڕایەوە ماڵەوە تەواو شەکەت بوو. توشی سەریەشەیەکی سەخت ببوو.پشتیشی دەیەشا... ئەوەندە شەکەت وبێتاقەت بوو، ویستی بەبی شێوخواردن بنوێت... دایکی لێی پاڕایەوە... لەبەر خاتری دایکی لەدەوری مێزی نان خواردنەکە دانیشت.زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا، هاوڕێیەکی لەسەر هێڵ بوو! بانگهێشتی کرد بۆسەماکردن! چاوەکانی درەوشانەوە و، هەموو گیانی پڕبوو لەشادومانی.

بەپەلە ڕۆشتە نهۆمی سەرەوە وپۆشاکە شینەکەیی لەبەرکرد، تاکو کاتژمێرسێی سەرلەبەیانی سەمای کرد!کاتێ گەڕایەوە ماڵەوە، هیچ شەکەت نەبوو!! بەڵکو هێندە دڵخۆش بوو نەیدەتوانی بنوێ.

جانایا (ئەلیس) بەر لەهەشت کاتژمێر، شەکەت بوو، کاتێ خۆی واپیشاندەدا کەزۆر هیلاك وشەکەتە؟ بەڵێ، بەدڵنیاییەوە، زۆر هیلاك بوو، چونکە لەکارەکەی بێتاقەت ببوو، تەنانەت ڕەنگە لەژیانیشی بێتاقەت بوبێت... ملیۆنەها کەس لەدونیادا وەك ئەووان، پێدەچێت تۆی خوێنەریش یەکێك بیت لەو ملیۆنەها کەسە.

ئەمە ڕاستیەکی زانراوە کەبارو دۆخە سۆزداریەکانمان پتر لەهەر کۆششێکی جەستەیی دەبێتە هۆی هیلاك بوونمان... چەند ساڵێکی کەم بەر لەئێستا(جۆزیف ئی.بارماك) دکتۆری فەلسەفە، لە(ئەرشیفی دەروونناسی )دا ڕاپۆرتێکی سەبارەت بەهەندێ لەئەزمونەکانی خۆی بڵاو کردەوە، لەو ڕاپۆتەدا ئەوەی ڕوون کردبویەوە کەچۆن ڕەش بینی دەبێتە هۆی شەکەت بوون.

(دکتۆر بارماك) ژمارەیەك لەقوتابییەکانی خستە ژێر زنجیرەیەك ئازمایشەوە کەدەیزانی ئەو ئەزمونانە هیچ خرۆشانێك لای قوتابییەکان دروست ناکات.ئەی ئەنجامەکەی چی بوو؟ قوتابییەکان هەستیان بەهیلاکی کرد ودەستیان کردە باوێشك دان... سەریان هاتە ئێش وچاوەکانیان گلی دەکرد... تەنانەت هەندێکیان هەستیان بەتێکهەڵاتنی گەدەیان دەکرد.ئایا هەموو ئەم قسانە ئەندێشەن؟ .نەخێر، چونکە پشکنینی پزیشکی بۆ ئەو قوتابیانە کرا، دەرکەوت هەرکاتێ مرۆڤ هەست بەبێتاقەتی ودڵگرانی بکات فشاری خوێن وئاستی ئۆکسجینی لەشی دادەبەزێت. هەرکاتێکیش مرۆڤ هەست بکات گرنگی پێ دەدرێت وکارەکەیی خۆش بوێت، جەستەی دەچێتەوە باری ئاسایی خۆی.

زۆر بەدەگمەن هیلاك دەبین لەکاتێکدا بەکارێکی خۆش ودڵخۆشکەرەوە سەرقاڵ دەبین.بۆ نمونە: جارێکیان ماوەی پشوەکەمم بردە شاخەکانی (ڕۆکی) کەنەدا لەدەورو بەری دەریاچەی (لویس)دا.ماوەی چەند ڕۆژێکم بەڕاو کردنی ماسیەوە بەشێوازی تایبەتی خۆم بەسەربرد.بەڕێگەیەکدا دەڕۆشتم گژوگیاکانی بەتەواوی بەژن وباڵامیان دادەپۆشی... دوای ئەوەی هەشت سەعات بەناو ئەو گژوگیا زۆر وزەوەندەدا ڕێم دەبڕی، هەرگیز هەستم بەهیلاکی نەدەکرد.بۆچی؟ چونکە حەزم لەوکارە دەکرد، هەستم بەباڵایی وبەرجەستە کردنی خود دەکرد، بەتایبەت چونکە ماسی گەورەم ڕاودەکرد.

بەڵام باوای دابنێین ڕاوەماسی بەلای منەوە خۆش نەبوایە ومایەی نیگەرانی بوایە، لەو حاڵەتەدا پێت وایە هەستی من چۆن دەبوو؟ بێگومان هەستم بەشەکەتی دەکرد بەهۆی ئەوکارە ناڕەحەتەوە، کەلەسەروی حەوت هەزار پێوە جێبەجێم دەکرد.

تەنانەت لەکاتی کردنی چەند کارێکی ناڕەحەتی وەکو خزینی سەرشاخ، ڕەنگە دڕدۆنگ بوون لەهەرکارێکی ناڕەحەتی ئاسایی پتر بەسەرتدا زاڵ بێت.بۆ نمونە: بەڕێز(س.هـ.کینگمان) سەرۆکی بانکی- بەرهەمهێنانی جوتیارو پیشەوەرەکان لە(مینا پۆلیس) باسی ڕووداوێکی بۆ کردم کەدەکرێ ببێتە نمونەیەکی جوان لەسەر ئەم بابەتە.ڕوداوەکەش ئەوەیە لەمانگیتەمموزی ساڵی ١٩٤٣دا، حکومەتی (کەنەدا) داوای لەیانەی (باین)ی کەنەدی کرد تاکو چەند ڕاهێنەرێ دەست نیشان بکات بۆ ڕاهێنانی ئەندامانی (برینس ئۆن وایلن) لەسەر خزینی سەر شاخ.

بەڕێز(کینگمان) یەکێك دەبێت لەوکەسانەی کەدەست نیشان کراون بۆ ڕاهێنانی گروپەکە.

ئەم بەڕێزە باسی ئەوەی بۆ کردم کەچۆن خۆی وڕاهێنەرەکانیتر (کەهەموویان پیاو بوون وتەمەنیان لەنێوان ٤٢-٥٩ساڵیدا بوو) ئەو گەنجانەیان دەبردە سەر بەرزاییەکان، بەسەر چاڵە بەفرو سەهۆڵبەنداندا دەیانبردنە جێگەی واکە چل پێ بەرز بوو، دەبوا بەگوریس خۆیان بخزاندایە وجێ پێیان بۆ خۆیان دروست بکردایە.لەلوتکەکانی (میشیل وفایس برازید منت) وچەندین لوتکەی تری دۆڵی (یوهو)ی چیای(ڕۆکی) دا، هەڵژنان وداخزانیان ئەنجامدا.دوای پانزە کاتژمێرلەخزان بەسەر چیادا، گەنجەکان هەستیان بەشەکەتی تەواوەتی کرد، چونکە ڕاهێنانی شەش هەفتەیان لەیەك ڕۆژدا تەواو کردبوو.

جائایا هۆکاری شەکەتیەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ بەکار هێنانی ماسولکەکانیان کەهێشتر ڕاهێنانی سەربازییان پێ نەگەشتبوو؟ هەر پیاوێ مەشقی سەربازی بینی بێت گاڵتە بەم پرسیارە دەکات!نەخێر، شەکەت بونەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ بێتاقەت بونیان لەهەڵخزانی سەرشاخ.هێندە هیلاك بوون هەر ئێوارە نوستن بی ئەوەی شێوبخۆن.

وەڵێ ڕاهێنەرەکان(کەتەمەنیشیان سێ بەرانبەری تەمەنی سەربازەکان بوو) ئایا هیلاك بوون؟ بەڵێ، هیلاك بوون لەڕووی جەستەییەوە، بەڵام شەکەت نەبوون.ئەوان شێویان خوار دوو چەندکاتژمێرێکیش لەدوای شێوخواردن دانیشن وباسی ئەزمونەکانی ئەو ڕۆژەیان دەکرد.هەستیان بەشەکەتی نەدەکرد.چونکە کارەکەیان دەیوروژاندن.

کاتێ دکتۆر (ئیدوارد سۆرندایک) لەزانکۆی (کۆلۆمبیا) چەند تاقی کردنەوەیەکی لەسەر شەکەتی ئەنجام ئەدا، کارێکی وای دەکرد گەنجەکان بۆ ماوەی هەفتەیەکی تەواو نەدەخەوتن، چونکە سەرقاڵی دەکردن بەکاری سەرنج ڕاکێش وخۆش وپڕلەجۆش وخرۆشەوە، لەپاش وورد بونەوەی تەواو، ئەوجا دکتۆر سۆرندایک گوتی: (بێزاری تاکە هۆکاری ڕاستەقینەی کەمکردنەوەی کارە).

ئەگەر تۆ کرێکاری هزربیت، زۆر بەدەگمەن ڕوو دەدات بڕی کارەکەت ببێتە هۆی هیلاك بوونت. بەپێچەوانەوە، لەوانەیە بڕی ئەو کارە هیلاکت بکات کەئەنجامت نەداوە.بۆ نمونە ئەو ڕۆژەی هەفتەی ڕابوردوت لەیادە، کەکارەکانت بچڕ بچڕ دەکرد؟ وەڵامی هیچ نامەو پەیامێکت نەدایەوە و لەوادەکانت دواکەوتیت و، لێرە ولەوێ گرفت ڕووی تێ دەکردیت... ئەو ڕۆژە هەموو کارو بارەکانت بەشێوازێکی نادروست وهەڵە گوزەران، هیچ کارێکت ئەنجام نەدا... کاتێ بۆ ماڵەوە گەڕایتەوە، شەکەت وماندوو ببویت ودووچاری سەریەشەیەکی زۆریش هاتبویت.

ڕۆژی دواتر، کارەکانت لەنوسینگەکەت بەشێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە چوون.چەند بەرابەری ڕۆژانی پێشوو کارت کرد... بۆیە بەچوست وچالاکی گەڕایتەوە ماڵەوە، وەکو گوڵ گەشابویتەوە.

تۆ بەو ئەزمونەدا ڕەت بوویت، منیش بەهەمان شێوە، ئەزمونی وەك ئەوەی تۆم بەسەردا تێ پەڕیوە.

چ پەندێ لەو ئەزمونە هاوبەشە وەردەگرین؟ زۆر بەسادەیی ئەوەی لێ وەردەگرین کەئەو شتەی دەبێتە هۆی هەراسان کردن وبێتاقەت وشەکەت کردنمان، کارکردن نیە.بەڵکو دوودڵی وچەپاندن وبی ئومێدیە.

وەختێ سەرقاڵی نوسینی ئەم بەشە بووم، ڕۆشتم بۆ سەیرکردنی شانۆگەری کۆمیدی(جیروم کیرن).کاپتن ئاندی کاپتنی گوڵی لۆکە، ل یەکێك لەبڕگە فەلسەفیەکانیدا دەڵێت: (گەلە بەختەوەرەکان، ئەو گەلانەن کەپێویستە لەسەریان کارگەلێ بکەن کەچێژ وەردەگرن لەکردنی کارەکان)... میللەتانێکی ئاوها، بەختەوەرن، چونکە وزە وتوانای زۆرتر وشادومانی پتریان هەیە، کەمتریش دوو دڵیوشەکەتی بەخۆوە دەبینیت.سەرچاوەی جۆش وخرۆش لەهەرکوێ بێت، وزە وتواناش لەوێندەرە.

دەهەنگاو ڕێ بڕین لەگەڵ هاوسەرێکی ڕەزا گراندا، پتر مرۆڤ شەکەت دەکات لەوەی دەمیل لەگەڵ کچێکدا ڕێ بکات کەخۆشی بوێت!.

ئەمە یانی‌چی؟ تۆ دەتوانیت چی بکەیت؟ ... یەکێك لەئافرەتە سکرتێرەکانی کۆمپانیایەکی نەوت لە(تۆڵسا)ی ویلایەتی (ئۆکلاهۆما) دەکرێ لەم ڕووەوە بکرێتە نمونە. دەبوو لەمانگێکدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك خەریکی کارێکی ناڕەحەت وبێزار کەربێت، دەبوا گرێ بەستە چاپکراوەکانی کۆمپانیای پڕبکردایەتەوە وژمارە وئامارەکانیشی ئامادە بکردایە. ئەم کارانەش زۆر بێزار کەربوون. بەڵام ئەم ئافرەتە بڕیاریدا کارە کەبۆ خۆی خۆش وسەرنج ڕاکێش بکات.چۆن؟ دەستی کردە کێبەرکێیەکی ڕۆژانە لەگەڵ خۆیدا، ئەو گرێ بەستانەی دەژمارد کەلەڕۆژێکدا پڕی دەکردنەوە، هەوڵی ئەدا ڕۆژی داهاتوو لەو ژمارەیە زیاتر پڕبکاتەوە.ئەی ئەنجامی ئەم کارە چی بوو؟ لەئەنجامدا توانی لەهەر کچەنوسەرێکی تر زیاتر گرێ بەست پڕبکاتەوە..ئەی ئەو پاداشتە چی بوو کەبەدەستی هێنا؟ سوپاس وستایش بوو؟ نەخێر..

پلەبەرزکردنەوە بوو؟ نەخێر... دەستکەوتنی داهاتی زۆر تربوو؟ نەخێر.بەڵکو پاداشتەکەی بریتی بوو لەخۆشی دوور کەوتنەوە لەو شەکەتیەی کەلە ئەنجامی ڕانەپەڕاندنی کارەکەیدا هەستی پێدەکرد..هەروەها هاندەرێکی ئەقڵی وایشی پێ بەخشی کەبتوانێ ئەو پەڕی توانای بخاتە کار بۆ ئەوەی کارە بێزراو وناڕەحەتەکەی، بگۆڕێت وبیکاتە کارێکی خۆش وبەتام!!.

بۆیە بویە خاوەن توانایەکی زیاتر لەفەرمانبەرەکانی تری کۆمپانیا، بەو پێیەش زیاتر لەوان خۆشحاڵ دەبوو لەکاتەکانی بێکاری ودەست بەتاڵیدا... من زۆر باش دەزانم ئەم بەسەرهاتە ڕاست ودروستە، چونکەخۆم هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەوکچەدا کردووە.

کچە تایپیستێکی تر، گەشتە ئەو بڕوایەی کەباشتر وایە مرۆڤ واهەڵسوکەوت بکات کەئەو کارەی دەیکات سەرنج ڕاکێش وخۆشە، هەرچەندە بەر لەو بەسەرهاتە ڕقی لەکارەکەی دەبووەوە.ئەوخاتونە ناوی (فالی.ج.گۆڵدن)ەو لەشەقامی(کنیلۆرسی باشور) ژمارە (٤٧٣) ی(ئیللینوا) دەژی... ئەو خانمە بەسەر هاتەکەی بەم شێوەیە بۆ من نوسیوە:

لەنوسینگەکەمدا جگە لەخۆم چوارکچی تر هاو ڕێمن، ئێمە نامەو پەیام لەچەند فەرمانبەرێکەوە وەردەگرین و تایپی دەکەین. ڕۆژێکیان هەموومان زۆر سەرقاڵی ئیش بوین وشەکەت ببوین، بۆیە کاتێ یاریدەدەری بەڕێوەبەر پێداگری کرد لەسەر ئەوەی نامەیەکی درێژ دووبارە چاپ بکەمەوە، زۆر توڕە بووم.هەوڵمدا قەناعەتی پێ بکەم دەتوانم نامەکە ڕاست بکەمەوە، بێ ئەوەی ناچاربم دووبارە چاپی

بکەمەوە.بەڵام ئەو لەوەڵامدا گوتی: ئەگەر دووبارە چاپی نەکەیتەوە، ئەوا دەتوانم لەبری تۆ کەسێکی تر بدۆزمەوە ئەوکارەم بۆ بکات!بەو قسەیە زۆر پەست بووم! وەلێ کاتێ دەستم کردبە چاپکردنی نامەکە، هات بەخەیاڵمدا کەچەندین ئافرەت هەن چاوەڕوانی هەلێك دەکەن بۆکارکردن.پاشان من موچەیەك وەردەگرم لەبەرانبەر ئەوکارەدا... هێندی هێندی بەرەوباشی دەچووم.لەناکاو وام لێهات گرنگیم بەکارەکەم ئەدا، وەك ئەوەی چێژی لێوەربگرم-هەرچەندە لەڕاستیشدا ڕقم لێی بوو- پاشتر شتێکی پڕبایەخم دۆزیەوە: ئەگەر من بەشێوەیەك کاربکەم وەك ئەوەی چێژی لێوەربگرم، ئەوادەتوانم لەڕاستیشداچێژی لێوەربگرم... هەروەها گەشتە ئەو دەرەنجامەی کەهەرکاتێ چێژم لەکارەکەم وەرگرت، دەتوانم زۆر بەخێرایی تەواوی بکەم.بەوپێیەش زەرورەتێ نابێ بۆئەوەی لەکاتەکانی بەتاڵیدا کاربکەم.

ئەم شێوازە تازەیەم کردمیە ژنە تایپیستێکی باش، بۆیە کاتێ بەڕێوەبەری یەکێك لەلقەکان داوای سکرتێرەیەکی تایبەتی کرد، داوای لەمن کرد ئەو پۆستە وەربگرم، گوایە من، وەك ئەودەیگوت، حەزم لەکاری زیاترە بێ ئەوەی بێزاربیم!بەڕاستی گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوە، دۆزینەوەیەکی زۆربایەخدار بوو بۆمن... وەکوجادویەك کاری لێکردم)!.

خاتوو(گۆڵدن) فەلسەفەکەی مامۆستا(هانزفاینگر)ی بەکارهێناوە کەفێرمان دەکات هەمیشە لەهەڵس وکەوتەکانماندا واخۆمان نیشان بدەین کەخۆشحاڵ وشادومانین.ئەگەر واخۆت نیشان بدەیت کەگرنگی بەکارەکەت ئەدەیت، ئەم هەڵس وکەوتە وات لێدەکات کە لەڕاستیشدا

گرنگی بەکارەکەت بدەیت، هەروەها دەبێتەهۆی کەم بونەوەی شەکەتی وپاراپی و دوودڵیت.

چەندساڵێکی کەم لەمەوبەر، (هارلن هوارد) بڕیارێکیدا، بڕیارەکە هەموو ژیانیگۆڕی. بڕیاریدا کارە تەرێزلێکراوەکەی بگۆڕێت وبیکاتە کارێکی خۆش.هەرچەندە لەڕاستیشدا کارێکی ناڕەحەت بوو.کارەکەی شۆردنی قاپ وقاچاخ وئامێرەکانی بەستەنی (ئایس کرێم) بوو لەژووری چێشتخانەی قوتابخانەیەکدا.لەکاتێکدا قوتابیەکانی هاوڕێی یاری تۆپێنیان دەکرد یاخود گاڵتەوگەپیان لەتەك کچەکاندا دەکرد. (هارلن هوارد) زۆر ڕقی لەکارەکەی بوو، بەڵام چونکە هەردەبوو ئەوکارەبکات، بڕیاریدا لەگەڵیدا دەست بکات بەلێکۆڵینەوە لەڕێگەکانی دروستکردنی ئایس کرێم.ئەوەبوو دەستی کردە خوێندنی (کیمیای خۆراك) تەنانەت چوە کۆلیژی (ماساشۆستس)وبویە پسپۆڕی زانستی خۆراك ناسی.

ئەودەمەی (کۆمپانیای کاکاوی نیویۆرك) خەڵاتی سەددۆلاری دانابۆباشترین توێژینەوە سەبارەت بەسودەکانی شەکولاتە وکاکاو- کەئەم خەڵاتەش کراوەبوو بۆ هەمووقوتابیانی کۆلیژەکە... گومانت وایە خەڵاتەکە بەرکێ کەوتبێ؟ ... بێگومان هارلن هوارد، ئەوخەڵاتەی بەدەست هێنا.

کاتێکیش هەستی کرد ناتوانێ کارێ پەیدابکات، هەستا لەنهۆمی خوارەوەی خانوەکەیدا کەدەکەوتە شەقامی (pleasamt )ی باکورەوە لە(ئەمرست) یویلایەتی (ماساشۆستس)، تاقیگەیەکی کردەوە.

بەماوەیەکی کەم لەدوای ئەوە، بڕیارێکی نوێ دەرچوو، ئامارکردنی ژمارەی بەکتریا لەشیردا.بۆیە دەست بەجێ (هارلن هوارد) دەستی کردە

ئامارکردنی ژمارەی بەکتریا بۆ(١٤) کۆمپانیای بەرهەمهێنانی شیرلە(ئەمرست)دا، ئەم سەرقاڵیەش وایکرد پەنابەرێتە بەرئەوەی چەند کەسێك بۆهاوکاریکردنی خۆی دەست نیشان بکات.

بیست وپێنج ساڵ دواتر، هارلن هوارد بویە یەکێك لەکەسایەتیە ناسراوو پسپۆڕەکانی بواری کارەکەی، لەکاتێکدا هاوڕێکانی تری کەئەم ئایس کریمی پێ دەفرۆشتن، بێکاربوون ونەفرەتیان لەحکومەت دەکرد لەبەر ئەوەی هەلی کارکردنی بۆنەڕەخساندبوون.ڕەنگە بواری کارکردن بۆ هارلن هواردیش نەڕەخسایە ئەگەر نەیتوانیبا کارەناڕەحەت وناخۆشەکەی لای خۆی بگۆڕێت و، وەك کارێکی خۆش وسەرنج ڕاکێش لێی بنوارێت.(هـ.ف کالتنبۆرن) شیکەرەوەی بەناوبانگی هەواڵ لەڕادیۆدا، باسی ئەوەی بۆکردم کەچۆن توانی کارەناخۆشەکەی بگۆڕێت ووەك کارێکی سەرنج ڕاکێش سەیری بکات. ئەم پیاوە لەتەمەنی بیست ودووساڵیدا، لەسەرپشتی کەشتیەکی گواستنەوەی ئاژەڵان، بەسەردەریای ئەتڵەسیەوە، کاری ئەوە بوو ئالف وئاوی دەدایە ئاژەڵەکان، لەپاش گەڕانێك بەدەوری ئینگلتەرادا، بەڕووت ورەجاڵی وبێ پارەو پول هاتەوە پاریس.لێرە کامیرایەکی خستە بارمتەوە لەبەرانبەر پێنج دۆلاردا بۆ دابەزاندنی ڕیکلامێك لەڕۆژنامەی (نیویۆرك هیراڵد)دا، تاکو کارێکی لەفرۆشتنی دووربین وکامیرا دادەست بکەوێت.

ئەگەر تۆکەسێکی بەتەمەن بیت لەوانەیە ئەو ئامێرانەت لەبیربێت، ئامێرەکان وادروست کرابوون دەتتوانی بەهۆیانەوە دوو وێنەی تەواو لێك چوو ببینیت.کاتێ لەمیانەی ئەو ئامێرانەوە تەماشات دەکرد، سەیروسەمەرە ڕووی ئەدا... هەردوو عەدەسەکە، دوو وێنەکەیان دەکردە

یەک وێنە، بەهۆی بوونی دووری سێیەم لەنێوانیاندا. وەک پێشتر گوتم، کالتنبۆرن دەستی کرد بەفرۆشتنی ئەم ئامێرانە، هەرچەندە زمانی فەرەنسیشی بەباشی نەدەزانی بەڵام درگابەدرگا دەگەڕا ولەدرگاکانی ئەدا تاکو ئامێرەکانی بفرۆشێت.

بەڵام توانی بەم کارە لەساڵێکدا پێنج هەزار دۆلار پەیدابکات، ئەم پارەیەش زۆرترین کرێ بوو کەلەفەرەنسادا کرێکارێکی دەستگێڕ توانیبێتی بەدەستی بێنێت... کالتنبۆرن باسی ئەوەی بۆکردم کەئەم سەرکەوتنە هاندەرێکی لەناخیدا دروست کرد بۆئەوەی وەک هەر قوتابیەکی تر لەزانکۆی (هار فارد) سەرکەوتن بەدەست بێنێت.لەپاش ئەم ئەزمونە هەستی کرددەتوانێ (تۆمارەکانی کۆنگریس) بفرۆشێت بەژنە فەرەنساییەکان. ئەم ئەزمونە تازەیەش تێگەیشتنێکی وردی لەبارەی ژیانی فەرەنساییەوە پێ دەبەخشی، ئەم تێگەشتنە ووردەیش زۆرگرنگ بوو بۆئەوەی بتوانێ لەڕادیۆدا ڕووداوە ئەوروپییەکان شیی بکاتەوە!.

ئایا ئەم پیاوە چۆن توانی کاروبارەکانی خۆی ڕێک بخات و، لەگەڵ ئەوەشداکە زمانی فەرەنسی نەدەزانی، کەچی بویە فرۆشیارێکی شارەزا؟ باشە، داوای دەکرد لەبەکاربەرەکەی ئەوڕستانەی بۆبنوسێتەوە کەلەفرۆشتندا پێویستی پێیان دەبوو، ئینجا ئەو ڕستانەی لەبەر دەکرد.لەهەردرگایەکی دەدا، کابانیماڵەکە وەڵامی دەدایەوە، ئەمیش بەشێوەیەکی ناڕەوان دەستی دەکردە گوتنەوەی ئەوڕستانەی کەلەبەری کردبوون، پاشان وێنەکانی دەخستە بەردەمی کابانی ماڵەکە، ئەگەر

ژنەکە هەرپرسیارێکیشی لێ بکردایەن ئەم شانی هەڵدەتەکاند ودەیگوت:
(من ئەمریکیم... من ئەمریکیم).

دواتر شەپقەکەی دادەکەنێت وئاماژەدەکات بۆئەو لاپەڕەیەی کەبەزمانێکی فەرەنسی ڕێک وڕەوان هەندێ قسەی تێدا نوسیبویەوە وچەسپی کردبووبەناو شەپقەکەیەوە.کابانی ماڵەکە بەوەزیاتر پێدەکەنی، خۆیشی لەگەڵ ئەودا بەخۆی پێدەکەنی!کاتێ کالتنبۆرن ئەوقسە وباسەی بۆ گێڕامەوە، دانیشی بەوەدانا کەکارەکە ئاسان نەبور، بەڵام سەرکەوتنی لەوکارەدا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەپێداگربوو لەسەرئەوەی چێژ ببەخشێتە کارەکە.هەموو بەیانیەك لەبەردەم ئاوێنەدا ڕادەوەستا وبەخۆیی دەگوت: ( کالتنبۆرن، ئەگەر بتەوێت بژیت پێویستە ئەوکارەبکەیت.جامادەم دەبێ هەر ئەوکارەبکەیت، بۆچی چێژوخۆشیەکی پێ نابەخشیت؟ بۆچی خۆت وەك ئەکتەرێك سەیرناکەیت، هەرکە لەدرگایەکیش دەدەیت، وابزانە لەسەرتەختی شانۆ ولەبەردەم جەماوەردا کاری نواندن ئەنجام دەدەیت؟ بەرلەهەرشتێ، خۆئەوکارەی تۆدەیکەیت وەکو هەر شانۆگەریەکی ترجێگەی سەرنجە.کەواتە بۆچی هەموو دڵگەرمی وتواناکانت تەرخان ناکەیت بۆئەوەی بەجوانترین شێوە کارەکەت ئەنجام بدەیت؟ .

کالتنبۆرن باسی ئەوەی بۆکردم کەئەم وتوێژە ساکارانەی ڕۆژانە لەگەڵ خۆیدا ئەنجامی دەدا، بویەیارمەتی دەری بۆخۆشکردنی کارەکەی.ئەوئیشەی ئەم ڕقی لێی دەبویەوە، بەهۆی ئەو وتوێژانەوە گۆڕاو بویەکارێك کەتەواو حەزی لێی دەکرد وقازانجی زۆر وبەلێشاوی لێیەوە بەدەست دەهێنا.

کەلەبەڕێز (کالتنبۆرن) م پرسی، ئایا هیچ ئامۆژگاریەکت پێیە بۆئەو گەنجانەی کەلەئەمریکادا بەدوای سەرکەوتندا وێڵن، گوتی: (بەڵێ، هەموو بەیانیەک لەگەڵ خۆتاندا بدوێن.ئێمە زۆرجارباس لەگرنگی ڕاهێنانی جەستەیی دەکەین کەلەخەواڵویی ڕزگارمان دەکات.بەڵام لەوڕاهێنانەش زیاتر ئاتاجمان بەڕاهێنانی ئەقڵی وڕۆحی هەیە، تاکو پاڵمان پێوەبنێت بەرەوکار کردن... هەموو بەیانیەک لەگەڵ خۆتدا بدوێ).

ئایا ئەگەر بەیانیان لەگەڵ خۆتدا بدوێیت، کارێکی هیچ وپوچ ومنداڵانەت کردووە؟ نەخێر.بەپێچەوانەوە، کارێکی ڕاست ودروستت کردووە.چونکە ئەوەبناغەی دەروونناسیە.

(ژیانمان بریتیە لەوەی بیروبۆچوونەکانمان وێنای دەکەن).ئەم وشانە ئەمڕۆش ڕاستن، وەک چۆن هەژدەسەدە بەرلەئێستا (مارکۆس ئۆریلیۆس) لەکتێبەکەیدا (تێڕامانەکان) ئاماژەی پێ کردوون.

ڕۆژانە لەمیانەی یەک سات دووان وهەڤپەیڤین لەگەڵ ناخی خۆتدا، دەتوانیت ڕێنمونی دەرونی خۆت بکەیت بۆ بیرۆکەی ئازایانە وبەختەوەرانە وبەهێزانە وپڕلەدڵنیایی. لەڕێگەی بیرکردنەوە لەبیروبۆچونی ڕاست ودروستەوە. دەتوانیت کارەکەت بکەیتە کارێکی واکەکەمترین قەڵسی وبێتاقەتی لەگەڵدا بێت.سەرۆکەکەت دەیەوێت گرنگی بەکارەکەت بدەیت بۆئەوەی خۆی پارەی زیاتری دەست بکەوێت.بەڵام تۆ ئەومەبەستەی سەرۆکەکەت لەبیربکە!.تەنها بیرلەوە بکەرەوە گرنگی دان بەکارەکەت چ دەستکەوتێ دەستی خۆت دەخات!بیرلەوە بکەرەوە کەگرنگیدان بەکارەکەت شادومانی وبەختەوەری

زیاتر دەبەخشێتە ژیانت.چونکە نیوەی ساتەکانی بێداریت لەکارکردندا دەگوزەرێنیت.جائەگەر لەکارەکەتدا هەست بەچێژ وبەختەوەری نەکەیت، ئەوا لەهیچ جێگەیەکدا هەست بەبەختەوەری ناکەیت.لەبیرت بێت بایەخدان بەکارەکەت دوودڵیت لەناودەبات، لەماوەی ئایندەی دووریشدا ڕەنگەببێتە هۆی بەرزبونەوەی پلەو زۆربونی دەستکەوت وداهاتەکانت.

تەنانەت ئەگەر ئەوەشت بۆ مسۆگەر نەکات، بێگومان شەکەتیت کەم دەکاتەوە ویارمەتیت ئەدات بۆ ئەوەی چێژلەکاتەکانی بێ کاریت وەربگریت.

# بەشی پێنجەم

## ئایانەوەی هەتە، دەیگۆڕیتەوە بە یەك ملیۆن دۆلار ؟!

ماوەی چەندساڵێکە (هارۆڵد ئەبوت) دەناسم، ئەولەشەقامی (ساوس مادیسۆن) ژمارە(٨٢٠) دەژی، بەڕێوەبەری پەیمانگاکەم بوو.ڕۆژێکیان لە(کنساس سیتی) چاومان بەیەکترکەوت، لەوێوە گەیاندمیەوە باخەکەی خۆم لەشاری (بلتۆن)ی ویلایەتی (میسوری).لەڕێگەدا، پرسیاری ئەوەم لێکرد، ئایا چۆن توانیویەتی دوودڵی لاوەبنێت؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بەسەرهاتێکی بۆگێڕامەوە کەهەرگیز لەبیرم ناچێتەوە.

لەوەڵامدا گوتی: (پێشتر هەمیشە دوودڵ ونیگەران بووم.بەڵام لەڕۆژێکی بەهاری ساڵی ١٩٣٤دا، بەشەقامی (دورتی ڕۆژئاوا) لە(وبی سیتی)دا دەگەڕام، دیمەنێکم بینی کەبویەهۆی ئەوەی دوودڵی ونیگەرانی لای من نەهێلا.ئەم ڕووداوە لەماوەی دەچرکەدا ڕویدا.وەلێ لەودەچرکەیەدا فێربووم چۆن بژیم، زیاتر لەوەی لەماوەی دەساڵدا فێربووم!... چونکە ماوەی دووساڵ بوو، لەشاری (وبی سیتی)دا دوکانێکی سەوزە ومیوە فرۆشتنم بەڕێوە دەبرد، لەوماوەیەدا نەك هەرئەوەی هەمبوو لەدەستمدا، بەڵکو لەنێو قەرزدا نقوم بووم، هێندە

قەرزاربووم، حەوت ساڵی ڕەبەق کارمکرد ئەوجا توانیم قەرزەکانم بدەمەوە. دوکانەکەم داخست وڕووم کردە بانکی (بازرگان وپیشەوەران) بۆ پارەقەرزکردن. تاکو بتوانم بەوپارەیە بگوازمەوە بۆ(کنساس سیتی)ولەوێ بەدوای کارێکدا بگەڕێم.

وەکو پیاوێکی دۆڕاو بەڕێدا دەڕۆشتم، هەموو ئازایەتی وبوێری و متمانەیەکم لەدەستدابوو.لەناکاو پیاوێکم بینی هەردوو قاچی قرتابوو.لەسەر کورسیەك (ڕەو ڕەوە) دانیشتبوو، بەهۆی دوودارەوە کەگرتبوی بەدەستیەوە ڕەو ڕەوەکەی بەسەرشەقامەکەدا لێدەخوڕی.

کاتێ من بینیم، لەشەقامەکە پەڕیبویەوە وخەریك بوو خۆی بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی بگاتە سەرشۆستەکە. لەگەرمەی ئەم هەوڵەیدا بوو.چاومان هەڵتۆقی بەیەکتریدا.زەردە خەیەنەکی پان وپۆڕی بۆ کردم وگوتی: بەڕێز بەیانیت باش، بەیانیەکی جوانە، وانیە؟ ).

کاتێ من بەپێوە ڕاوەستابووم وتەماشای ئەو پیاوەم دەکرد... هەستم کرد من چەندە دەوڵەمەندم... دوولاقم هەیە، دەتوانم بەڕێدابڕۆم. زۆرلەحاڵی خۆم تەریق بومەوە.لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ئەو پیاوە بەختەوەر وخۆشحاڵ بێت ومتمانەی بەخۆی هەبێت، لەکاتێکدا هەردوو لاقیشی لەدەست داوە، ئەی ئەبێ من چۆن بم کەهەردوو قاچیشم هەیە؟ هەستم بەشادومانی وحەوانەوەکرد، پێشتر بڕیارمدابوو بڕی تەنها سەد دۆلار لەبەنك بەوام وەربگرم، بەڵام لەدوای ئەم گۆڕانە بوێریم گەشتە ڕادەیەك بڕیارمدا بڕی دووسەد دۆلار وەربگرم.پێشتر دەمگوت: دەچم بۆ کنساس سیتی بەڵکو کارێك بدۆزمەوە، وەلێ لەئێستا بەدواوە دەڵێم: دەچم بۆکنساس سیتی بۆکارکردن!... لەئەنجامیشدا هەم وامەکەم

دەست کەوت وهەم کارەکەش. لەو ڕۆژەوە ئەم ڕستەیەم لەسەرناوینەکەم نوسی وهەموو بەیانیەك دەمخوێندەوە: (من غەمم بۆ ئەوەدەخوارد کەکەوشم نەبوو، کەچی لەسەر شەقامەکەدا چاوم بەپیاوێك کەوت هەردوو قاچی نەبوو)!!.

جارێکیان لە(ئیدی ڕیکنباکر)م پرسی: لەماوەی ئەو بیست ویەك ڕۆژەدا کەلەگەڵ هاوەڵەکانتدا لەنێو بەلەمی ڕزگار بوندامایتەوە، باشترین وانە وپەندێ کەفێری بویت.چی بوو؟ لەوەڵامدا گوتی: باشترین پەند کەلەوئەزمونەوە فێری بووم ئەوە بوو کەنابێ بێزاری ڕوت تێ بکات، ئەگەر نان وئاوی پێویستت لابێت.

ڕۆژنامەی(تایم) وتارێکی بڵاوکردەوە سەبارەت بەسەرکردەیەکی سەربازی کەلەنۆکەندی گۆدالدا برینداربوو، پارچەیەك بەرقوڕگی کەوتبوو.ئەم سەرکردەیە لە نۆژدارەکەی دەپرسێت: ئایا من دەژیم؟ پزیشکەکە دەڵێت: (بەڵێ)... دووبارە لێی دەپرسێت: ئایا دەتوانم لەمەولا قسەبکەم؟ پزیشکەکە لەوەڵامدا دەڵێت(بەڵێ)... دوای ئەوە، سەرکردە بریندارەکە دەنوسێت: (کەواتە ئیتر من بۆ ئەوەندە دوو دڵ ونیگەران بم؟ .

بۆچی تۆش ڕاناوەستیت ولەخۆت بپرسیت: (من بۆچی دوودڵم؟ ) ڕەنگە بەهۆی ئەم پرسیارەوە بگەیتە ئەوبڕوایەی کەئەوەی نیگەرانی کردویت شایستەی نیگەران بوون نیە.

نزیکەی لەسەدا نەوەتی شتەکان لەژیانمدا ڕاست ودروستن و لەسەدا دەشیان هەڵەن. جائەگەر بمانەوێت بەختەوەربین، پێویستە تەنها تەرکیز بخەینە سەرلەسەدا نەوەتە ڕاستەکە. ئەگەر دەتەوێت نیگەران بیت وئازار

بچێژیت ودووچاری برینی گەدەببیت، ئەوا تەنها بایەخ بدە بەلەسەرا ئەی لایەنەهەڵەکان ولەسەدا ئەوەتی شتەڕاستەکان فەرامۆش بکە.

هەردوو وشەی (بیرکەرەوە وسوپاس گوزاربە) لەدێرزەمانەوە نوسراون وهەموو ئاینەپیرۆزە ئاسمانیەکانیش بانگەشەیان بۆ کردووە، بیربکەرەوە وسوپاسگوزاربە، بیربکەرەوە لەهەموو ئەوشتانەی کەئاواتیان بۆدەخوازیت، سوپاسی خوداش بکە لەسەر ئەوەی پێتی بەخشیوە.

(جۆناسان سویفت) دانەری پەرتوکی (گەشتەکانی گالفیر) یەکێك بوولە نوسەرە هەرە ڕەش بینەکانی نێو ئەدەبی ئینگلیزی. زۆر پەشیمان بوو لەوەی لەدایك بووە.بەئەندازەیەك ڕەش بین بوو، کەخۆی ڕەش پۆش دەکرد ولەیادی لەدایك بونیشیدا بەڕۆژوو دەبوو.لەگەڵ ئەوەشدا، لەترۆپکی ڕەش بینی وبێ ئومێدیدا، ستایشی سودەکانی شادومانی دەکات ورای دەگەیەنێت: (باشترین پزیشکەکان لەجیهاندا بریتین لەدکتۆر ڕیجیم و دکتۆر هێوری ودکتۆر بەختەوەری!).

دەتوانین لەهەمووو ساتەکانی ڕۆژدا سودوەرگرین لەخزمەتگوزاریەکانی (دکتۆر بەختەوەری!!) بەوەی سەرنجەکانمان چڕبکەینەوە لەسەر ئەوسامانە بەلێشاوەی کەهەمانە-سامانێك کەزیاترە لەوەی عەلی بابا... ئایا چاوەکانت دەفرۆشیت بەیەك ملیار دۆلار؟ ئەی قاچەکانت ودەستەکانت وگوێچکەکانت ومنداڵەکان وخێزانەکەت بەچەند دەفرۆشیت؟ هەموو ئەوسامانە بەنرخانە کۆبکەرەوە، ئەوسادەبینیت کەتۆ ئامادەنیت ئەوەی هەتە بگۆڕیتەوە بەهەموو سامانی بنەماڵەکەی ڕۆکفیلەر وفۆرد ومۆرگان پێکەوە!.

وەڵێ ئایا هەموومان دەرك بەم ڕاستیە دەکەین؟ نەخێر. وەك شۆپنهاوەر دەڵێت: (زۆرجەگمەنە بیر لەوەبکەینەوە کەهەمانە. بەڵکو هەمیشە بیرلەوە دەکەینەوە کەنیمانە!) بەڵێ، ئەم ئارەزوە گەورەترین کارەساتە لەسەر ڕووی زەویدا. ڕەنگەئەو ئائومێدیەش کەئەم ئارەزوە دروستی کردوە، زیاتربێت لەو ئائومێدیانەی کەهەموو جەنگ ونەخۆشینەکان لەمێژودا خوڵقاندویانە.

ئەمەش بویە هۆی ئەوەی (ژۆن بالمر) کەگەنجێکی ئاسایی بوو، بگۆڕێت و ببێتە کەسێکی زۆر تووڕە وبێزار، تەنانەت خەریك بوو ماڵەکەی خۆیی وێران دەکرد.. هەرخۆیشی ئەم بەسەرهاتەی لەبارەی خۆیەوە بۆ گێڕاومەتەوە.

بەڕێز بالمەر لەشەقامی نۆزدەی شاری(باترسۆن)ی ویلایەتی (نیوجرسی) دا دەژی... لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیدا دەڵێت: (کەلەسوپاگەڕامەوە، دەستم بەکارکردن کرد بۆخۆم. شەو وڕۆژ کارم دەکرد.کارەکانم بەڕێکوپێکی دەچوون بەڕێوە... وەڵێ هێندەی نەبرد سەریەشەکان دەستیان پێ کرد.پارچەی یەدەگم دەست نەدەکەوت. زۆر دەترسام لەوەی ئیش وکارەکانم ڕابوەستن، بەم هۆیەوە هێندەنیگەران وپەست وقەڵس بووم کەبەتەواوی گۆڕام و بوومە کەسێکی تووڕە.دەمزانی خەریکە ماڵەکەشم لەدەست دەربچێت... لەم ئاومـاوەدا، گەنجێکی کەمئەندامی خۆبەخش کەلای خۆم کاری دەکرد پێمی گوت: ئەی جۆنی، پێویستە لەخۆت تەریق بیتەوە وشەرم بکەیت.چونکە تۆپێت وایە تەنها تۆ لەم جیهانەدا کێشەو گرفتت هەیە.باوای دابنێین واپێویست بێت بۆماوەیەکیش لەکارکردن ڕابوەستیت.چی ڕوئەدات؟ .دەتوانیت دووبارە

دەست بەکاربکەیتەوە.تانەوڕادەیەی شتەکان بەلاتەوە ئاسایی دەبێتەوە.تۆزۆرت هەیە بۆ ئەوەی ڕژدیت پێ ببڕێ.لەگەڵ ئەوەشدا زۆر تورە ودڕدۆنگیت... من زۆر هیوا دەخوازم لەجێگەکەی تۆدا بوایەم!اسەیری من بکە، تەنها یەك قاچم هەیە.نیوەی ڕوخساریشم لەدەست داوە.کەچی هەرگیز بێتاقەتیش نابم. ئەگەر تۆش لەم هەموو سکاڵاکردن وبێتاقەتیەت وازنەهێنیت، ئەوە نەك هەر کارەکەت لەکیس دەچێت، بەڵکو تەندروستی ومال ومندال وهاوڕێکانیشت لەدەست دەدەیت!).

ئەم تێ بینیانە لەجێگەکەی خۆمدا ڕەق ڕایان وەستاندم! بیری خستمەوە کەچەندە حاڵ وباڵم باشە... بۆیە بڕیارمدا بگۆڕێم و ببمەوە بەپیاوەکەی جاران).

خاتونێکی هاوڕێم هەیە ناوی(لوسیل بلایك)ە.ئەمیش لەنێو تراژیدیادا جێنگڵی داوەبەرلەوەی فێر ببێت خۆشحاڵ بێت، لەبری ئەوەی نیگەران بێت لەبەر ئەوشتانەی کەنیەتی!.

چەندساڵێك لەمەوبەر (لوسیل)م ناسی، ئەو دەمە پێکەوە لەزانکۆی کۆلۆمبیادا وانەی نوسینی کورتە چیرۆکمان لەبەشی ڕۆژنامە گەریدا دەخوێند، ئەم خاتونە ماوەی نۆساڵە یەکەم خورپەی ژیانی بەرکەوتوە... لەو سەردەمەدا لەشاری (تۆسۆن)ی ویلایەتی (ئەریزۆنا)دا دەژیا.

خۆی ناوابەسەرهاتەکەی بۆمن گێڕایەوە: (لەنێو سەرقاڵی و گەرم وگوڕیدا دەژیام، ئۆرگۆنم لەزانکۆی ئەریزۆنا دەخوێند. بەشداری وانەکانی پزیشکی ومۆزیکم دەکرد ودەشچومە ئاهەنگ وسەما شەوانەش لەبەر ڕۆشنایی ئەستێرەکاندا سواری ئەسپی چالاك

دەبوم.بەیانیەك بەتەواوی داڕوخام... دووچاری نەخۆشیەکی دڵ بووم، پزیشك داوای لێکردم بۆماوەی یەك ساڵ لەجێگەدا بکەوم!!زۆر ترسام! ئەم شتانەبۆچی ڕوئەدەن؟ هاوارم کرد وگریام، بەڵام وەك چۆن نۆژدارەکە ئامۆژگاری کردم، هاتم ولەسەر جێگەکەم لێی کەوتم... دراوسێیەکم بوو ناوی بەڕێز(ڕۆدۆڵف)بوو، هونەرمەندبوو، پێمی گوت: تۆپێت وایەساڵێك مانەوە لەجێگەدا کارەساتە.بەڵام وانیە.چونکە لەم ماوەیەدا بوارت دەبێ زۆربەباشـی بیربکەیتـەوە وخـۆت بناسـیت... لەچـەندمانگێکی کەمـدا لەڕووی ڕۆحیەوە ئەوەندە گەشەدەکەیت کەلەماوەی ژیانتدا نەتتوانیوە هێنـدە گەشـە بکـەیت) بـەم قسـەیە کـەمێك هێـور بومـەوە... هەوڵمـدا هەستێکی ترسەبارەت بەکەوتنم لەسەرجێدا بۆدروست بکەم... دەستم بەخوێندنـەوەکرد لـەبارەی ئیحانـەوە..هەرلـەم کاتـەدا گوێم لەبێـژەرێکی ڕادیۆیـــوو دەیگـــوت: (تۆتـــەنها دەتوانیـــت دەربـــڕ لـــەوە بکـــەیت کەلەئەندێشەتدایە)لەوکاتانەدا لەم جۆرە قسانەم زۆر دەبیست، ئێستاش چونەتە نێو قوڵاییەکانمەوە. بۆیە بڕیارمدا تەنها بیرلەو بیرۆکانە بکەمەوە کەدەمـەوێت بەهۆیانـەوە بـژیم: بیرۆکـەکانی بەختـەوەری وشـادومانی وتەندروستی...

هەموو بەیانیەك کەهەڵدەستام لەخەو، خۆم ناچارکردبوو بیرلەوشتانە بکەمـەوە کەدەبونـە هـۆی حەوانـەوەم: هەسـت بەئازارناکـەم، کـچێکی جوانکیلە ولاویشم هەیە، چاوم هەیە وگوێچکەم هەیە، مۆسیقام هەیەو کـاتی تەواویـشم هەیـە بۆخوێندنـەوە، خـۆراکی چاك وهـاوڕێی باشیـشم هەیـە... لـەکاتی ڕێزکردنـی ئـەم ڕسـتانەدا هەسـتم بەبەختـەوەری زۆر دەکـرد.ئەمـەش وایکردبـوو، هـاوڕێ وناسـراوەکانم بەلێـشاو دەهاتنـە

سەردانم... قەرەباڵغیەکە ئەوەندە زۆربوو، پزیشکەکەم ناچار بوو تێ بینیەك بنوسێت وتیایدا ڕێگەبدات بەهاتنە ژوورەوەی تەنها یەك کەس بۆلام، ئەویش لەهەندێ کاتی تایبەتدا.ئێستا نۆساڵ بەسەر ئەورووداوانەدا تێپەڕیوە.ژیانێکی جوانم هەیە کەپڕەلەچوست وچالاکی، هەستیش بەمنەتباریەکی زۆر دەکەم بەرانبەر ئەوساڵەی کەتیایدا لەسەرجێگە کەوتبووم... چونکە خۆشترین ساڵ بووکەلەئەریزۆنا بەسەرم برد... تائەم ساتەش کەتێیدا دەژیم نەریتی ژماردنی ئەو نیعمەتانەی کەپێم بەخشراوە، لەلام ماوەتەوە، بێگومان بەهادارترین نەریتیشە کەمن هەم بێت... هەرچەندە شەرم دەکەم لەوەی دان بەوڕاستیەدا بنێم کەبەڕاستی من نەم دەزانی بژیم تائەوەدەمەی گەشتمە لێواری مەرگ!!.

لۆسیل بلایکی ئازیز، لەوانەیە ئەوەشەت نەزانیبا، وەڵێ تۆ هەمان ئەو وانەیە فێربویت کەبەرلە دووسەد ساڵ (سمۆئیل جۆنسۆن) فێری ببوو... دکتۆر جۆنسۆن دەڵێت: (نرخی نەریتی سەرنج دان لەلایەنە باشەکانیهەر ڕووداوێك، لەهەرساڵێکدا بەزیاترلە هەزارپاوەند مەزەندە ئەکرێ).

بۆزانیاریشت، ئەم قسانە کابرایەکی گەشبین وپسپۆڕ لەگەشبینیدا نەیکردون، بەڵکوپیاوێك کردوونی کەلەماوەی بیست ساڵی ڕەبەقی تەمەنیدا ئاشنابوو بەدوودڵی وهەژاری وبرسێتی، تادواجاریش بویە بەناوبانگترین نوسەری سەردەمەکەی خۆی.

(لۆگان پیرسۆڵ) ژمارەیەکی زۆر پەندی پیرۆزی لەچەندڕستەیەکی کەمدا کۆکردۆتەوە، کاتێ دەڵێت: (دووئامانج هەیە، پێویستە لەژیاندا

هەوڵی بۆبدەیت: یەکەم، بەدەست هێنانی ئەوەی دەتەوێت، دووەمیش چێژوەرگرتن لەوەی بەدەستت هێناوە... هیچ کەسیش ناگاتە ئامانجی دووەم مەگەر ئەوانەی کەزۆر داناوکارزانن).

ئایا دەتــەوێت بزانیــت چــۆن قــاپ وقــاخ شــۆردنی نێوچێــشتخانە دەگۆڕێت ودەیکەیتە ئەزموونێکی خۆش و بەسود؟ جفەرموکتێبێك لەبارەی ئازایەتی وبوێرییەکی لەڕادەبەدەرەوە بخوێنەرەوە، کەلەنوسینی (پۆرگیلد داڵ)ەوە ناوی (ئەمەوێت ببینم)ە!!.

نوسەری ئەو کتێبە خاتونێکی نابینایە، ئەم خاتونە ماوەی نیوسەدەی تــەواو نابینــابوو... خــۆی بــەم شــێوەیە وەســفی حــاڵی خــۆی دەکــات ودەنوسێت: (یەك چاوم هــەبوو، نەمدەتوانی بەوچاوەش بەباشی ببینم، بەڵکو دەبوو کتێبەکە بەدەستەوە بگرم و زۆر لەنزیك چاومەوە ڕایبگرم)!

لەگــەڵ ئەوەشــدا ڕازی نــەدەبوو خــەڵکی بــەزەییان پێیدابێتــەوە یــان بەدواکــەوتووی لەقەڵــەم بــدەن، کەمنــداڵ بــوو، دەیویــست یــاری (خــەت خەتێن) لەگەڵ منداڵانی تردا بکات.بەڵام نەیدەتوانی هێڵەکێشراوەکان لەسەرزەویەکە بەباشی ببینێت... بۆیە کاتێ منداڵەکانی ترلەیاری کردن دەبونــەوە ودەگەڕانــەوە بۆماڵــەوە، ئــەم لــەدەرەوە دەمایــەوە وبــەووردی سەرنجی هێڵە کێشراوەکانی سەرعاردەکەی ئەدا، تاکو هــەموو هێڵــەکان لەبەربکات ودواتر بتوانێ لەگەڵ هاوەڵەکانیا گەمەبکات.

هێندەی نەبرد بووە شارەزایی ئەم جۆرە وازیانە.لەماڵەوە دەیخوێند، کتێبەپیت گــەورەکانی لــەنزیکی چاویەوە دەگــرت، بەجۆرێ خــەریك بوو برژۆڵەکانی بەرلاپــەڕەکان دەکەوتن.لەئەنجامیشدا توانی دوو بڕوانامەی

زانکۆیی بەدەست بێنێت، یەکیان لەزانکۆی (مینیسوتا)و ئەویتریشیان لەزانکۆی کۆلۆمبیا.

ئەم خاتونە لە(توین گالی) کەگوندێکی بچکۆلانەبوو دەستی بەخوێندن کرد، دواجار بویە مامۆستای وێژەوڕۆژنامەگەری لەزانکۆی (ئۆگستانا) لەباشوری (داکۆتا)... ماوەی سیانزەسالی ڕەبەق لەوێدا مامۆستابوو.. کۆڕی لەبەردەم یانەکانی ژناندا پێشکەش دەکرد ولەڕادیۆشدا سەبارەت بەنوسەران وخوێندنەوەی کتێب بەرنامەی هەبوو... لەوبارەیەوە دەڵێت: (هەمیشە دەترسام لەوەی بەتەواوی بینایم لەدەست بدەم، وەڵێ بڕیارمدا بەسەرئەم ترسەشدا سەربکەوم، هەربۆیە شێوازێکی بەختەوەرانەم لەژیانداهەڵبژارد).

سالی ١٩٤٣، واتە ئەوساڵەی گەشتە تەمەنی پەنجا ودووساڵی، ڕوداوێکی سەیر وسەرنج ڕاکێش ڕویدا: نەشتەرگەریەکی لەنەخۆشخانەی بەناوبانگی (مایۆ) بۆکرا، ڕۆشنایی گەڕایەوە بۆ چاوەکانی، ئێستاش چەندبەرانبەر پێشوو چاوی دەبینێت!.

بەهۆی ئەم ڕووداوەوە درگای جیهانێکی سەیری پڕلەخۆشەویستی بۆکرایەوە، هەستی دەکرد تەنانەت قاپ شۆردنی نێوچێشتخانەش کارێکی زۆر خۆشە... لەو بارەیەشەوە دەڵێت: (بەوکەفەسپیەش یاریم دەکرد کەلەشۆردنی قاپەکان دروست دەبوو، دەستم پڕدەکرد لەکەفی گلۆپ کردوی سابونەکە و، لەبەر ڕۆشنایدا سەیرم دەکردو، هەموو ڕەنگە جوانەکانی پەلکەزێڕینەم تێدا دەبینی).

کاتێکیش لەپەنجەرەوە سەیردەکات، ئەوپاساریە باڵ خۆڵەمێشیانەی دەبینی کەبەنێو بەفرە باریوەکاندا دەفڕن، هەستی دەکرد ئەم

دیمەنــەجوانترین دیمەنێکــە کــەمرۆڤ چــێژلەبینینی وەربگرێــت... بۆیــە لەبەرخۆیەوەئەم وشانەی دەگوت:

ئــەی خــوای ئەرزوئاسمانــەکان... مــن سوپاســت ئەکــەم، سوپاســت ئەکەم!.

بیرلەوە بکەرەوە کەسوپاسی خودابکەیت لەبەرئەوەی دەتوانیت قاپ بشۆریت و دەتوانیت پەلکەزێڕینە لەنێوبڵقی کەفدا ببینیت وپاساریش ببینیت کەبەنێوبەفردا دەفڕێت!.

پێویستە لەحاڵی خۆمان تەریق بینەوە وشەرم دامان بگرێت.چەندین ڕۆژ وچەندین ساڵ لــەنێو بەهەشــتێکی پڕلەجوانیــدا دەژیــاین.کەچــی نەماندەتوانی ئەوجوانیە ببینین، یاخودچێژی لێ وەرگرین!!.

کەواتــە ئەگــەر دەتــەوێت لــەدووردڵی دوور کەویتــەوە ودەســت بــەژیان بکەیت، ئەواکاربەم ڕێسایە بکە:

نیعمەتەکانت بژمێرە، نەك ناڕەحەتی وشەکەتیەکانت!.

# بەشی شەشەم

## لەبیرت بێ، هیچ کەسێك پێلەقە لەسەگی تۆپیو نادات!

ساڵی ١٩٢٩، ڕوداوێکی سەیر ڕویدا وشڵەژانێکی لەنێوەندەکانی خوێندندا بەرپاکرد، خەڵکی لەهەموو قوژبنەکانی ئەمریکاوە ڕویانکردە شیکاگۆ بۆئەوەی ئەوڕوداوە ببینن... چەندساڵێك لەمەوبەر پیاوێك کەناوی (ڕۆبەرت هاچینز)بوو، لەزانکۆ دارتاش ومامۆستا وچەندپیشەیەکی تریشی هەبوو!... لەپاش هەشت ساڵ ئەم کابرایە هەڵبژێردرا بەسەرۆکی چوارەم دەوڵەمەندترین زانکۆ لەئەمریکادا، زانکۆی شیکاگۆ!!... ئەی تەمەنی لەوکاتەدا چەندبوو؟ ، تەمەنیشی سی ساڵان بوو... ئاخەر ماقوڵ نیە!! ڕۆشنبیرە گەورەکان لەم مەسەلەیە سەریان بادەدا... وەکو شمشێری بڕندە بارانی ڕەخنەکان لەهەموو لایەکەوە دابارین بەسەر ئەم کابرایەدا!هەندێك دەیانگوت: جاران ئاوا وئاوابوو! زۆر منداڵە... هەندێکی تردەیانگوت: پسپۆڕنیە وبیرۆکە

فێرکاریەکانیشی ڕوکەشن... کار گەشتە ئەوەی ڕۆژنامەکانیش بەشداریان کرد لەهەڵمەتە ڕەخنەییەکانی سەر ئەم کابرایەدا.

لەڕۆژی هەڵبژاردنیدا، هاوڕێیەکی باوکی (ڕۆبەرت هاچینن بەباوکی گوت: (ئەم بەیانیە توشی شۆك هاتم، وتارێکم خوێندەوە، ڕەخنەی توندی لەکوڕەکەی تۆدەگرت).

هاچینزی باوك، لەوەڵامدا دەڵێت: (بەڵێ ڕەخنەکان زۆر توندوتیژبوون، بەڵام لەبیرت بێ هیچ کەس پێلەقە لەسەگی تۆپیو نادات!).

بەڵێ، تاچەندەسەگێ بزێوبێت، ئەوەندەش خەڵك دەخوازن پێلەقەی لێبدەن، ڕوداوێکی بەم شێوەیەش بەسەر شازادە(وایڵن)دا هات کەدواتر بوویە ئیدواردی هەشتەم( دۆق وێندەرسۆن) ی ئێستا.شازادە کاتێ لەزانکۆی (دارتماوس)ی (دیفۆنشایر) دەیخوێند(ئەم زانکۆیە هاوتای زانکۆی دەریاوانی ئەناپۆلیسە) ئەودەمە لەتەمەنی چواردە ساڵیدابوو.ڕۆژێکیان، ئەفسەرەکان بینیان واشازادە ئەگری، پرسیاریان لێکرد چی ڕویداوە؟ !لە سەرەتاوە نەیویست ڕاستیەکەیان پێ بڵێت.بەڵام دواتر دانی پیادانا کە قوتابیە دەریاوانەکان پێلەقەیان لێداوە..!
فەرماندەی زانکۆی، مێردمنداڵەکانی کۆکردەوە وبۆی ڕوون کردنەوە کەشازادە سکاڵاوشکایەتی نیە، بەڵکو دەیەوێت هۆکاری ئەومامەڵە ڕەقە بزانێت... لەپاش ماوەیەك هێنان وبردن، قوتابیەکان دانیان بەوەدا ناکەبۆیە وایانکردووە، چونکە کاتێ دەبنەفەرمانبەر لەتیپەدەریاوانیەکانی شاهانەدا، دەتوانن بڵێن پێلەقەمان لەپاشاداوە!!.

بۆیە هەرکاتێ پێلەقەت لێدرا ورەخنەت لێگیرا، باش بزانە ئەوەکسی ڕەخنەگر لەنێو دەروونیدا هەستی بەگرنگی تۆکردووە.هەروەها مانای ئەوەش دەگەیەنێت کەتۆکارێکی وات بەجێ گەیاندوە کەشایستەی ئاوڕلێدانەوەیە... خەڵکێکی زۆرهەن کاتی لەکەسانی باشترلەخۆیان ڕەخنەدەگرن، ئیدی هەست بەقەناعەت دەکەن.

بۆنمونە: لەکاتێکدا ئەم بەشەم دەنوسی، نامەیەکم لەژنێکەوە پێگەیشت، لەونامەیەدا ڕەخنەی توندی گرتبوو لەژەنراڵ(ولیەم بۆس) دامەزرێنەری سوپای ڕزگاری... من بەر لەونامەیە، بەرنامەیەکم لەستایشی ئەوژەنراڵەدا پێشکەش کردبوو.بۆیە ئەو ژنە نامەیەکی بۆمن نوسیبوو، تیایدا گوتبووی ئەو ژەنراڵە هەشت ملیۆن دۆلاری لەوپارەیە دزیوە کەبۆهەژارانی کۆکردبویەوە. بێگومان ئەم قسەیە تۆمەتێکی پوچ بوو.وەلێ ئەم ژنەبەدوای ڕاستیدا نەدەگەڕا.بەڵکو دەگەڕا بەدوای قەناعەتێکدا کەلەڕێگەی شکاندنی مرۆڤێکی لەخۆی باشترەوە بەدەستی بێنێت.بۆیە میش نامەتوندوتیژەکەیم بڕکدایە نێو سەبەتەکەوە.سوپاسی خوایشم کردلەسەر ئەوەی کەمن مێردی ئەو ژنەنیم!نامەکەی ئەو ژنەهیچی لەبارەی ژەنراڵ(بۆس)ەوە، پێ نەگوتم، بەڵکو چەندڕاستیەکی لەبارەی خودی ژنەکەوە بۆ ڕوون کردمەوە. شۆبنهاوەر چەندساڵێك لەمەوبەر گوتویەتی: (خەڵکە بازاڕیەکە، چێژوەردەگرن لەدۆزینەوەی هەڵەو ناتەواوی لەپیاوە مەزنەکاندا).

کەسانێکی زۆر کەم، خەیاڵیان بەلای ئەوەدا ئەچێت کەسەرۆك (ییل) پیاوێکی بازاڕی بوبێت، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبینین ئەمیش چێژێکی زۆری وەرگرت لەسوکایەتی کردن بەپیاوێك کەلەسەرۆکایەتی ئەمریکا نزیك

دەكەوتەوە... سەرۆك (پیل) هۆشداریدا، ئەگەربێت وئەم پیاوە بۆپۆستی سەرۆكایەتی ئەمریكا هەڵبژێردرێت، ڕەنگە ژن وكچەكانمان ببنە قوربانی بەدڕەوشتیەكی یاسایی، خۆشمان دەبینە جێگەی سوكایەتی پێكردن وچاوبەست لێكردن، ئەوەش نەخواپێی قایلە ونەمرۆڤیش.

ئەمەش كتومت لەتۆمەتباركردنی هیتلەر دەچێت، وانیە؟ بەڵام وانیە.چونكە ئەم تۆمەتە ئاراستەی(تۆماس جیڤەرسۆن)ی دانەری (ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی) كراوە.

ئەبێ كام ئەمریكیە بێت كەتۆمەتباركراوە بەدووڕوویی وفێڵبازی وبەدی، گوایەكەمێك لەپیاوكوژێك باشتربووە؟ ڕۆژنامەیەك لەدیمەنێكی كاریكاتێریدا نیشانی دابوو، لەودیمەنەدا كێردێكی گەورەش لەپاڵیدا وێناكراوە، گوایە ئەم كێردەش بۆسەربڕینی ئامادەكراوە.لەولاشەوە جەماوەر گاڵتەی پێ دەكەن. ئەبێ ئەوپیاوە كێ بوبێت؟ ... ئەوپیاوە جۆرج واشنتۆن بوو، وەڵێ ئەم ڕووداوە ماوەیەكی زۆرە ڕوویداوە.ڕەنگە لەوساوە تاهەنوكە سروشتی مرۆڤ گۆڕابێت. بابزانین ئایا ئەوقسەیە ڕاستە... باوەك نمونە، ئەوبارودۆخە وەربگرین كەبەسەر (ئەدمیرال بیری) داهات. ئەو دۆزەرەوەیەی كەهەموو جیهانی سەرسامكرد.بەوەی كەتوانی ڕۆژی ١٩٠٩/٤/٦ جەمسەری بەستەڵەكی باكوری گۆی زەمین بدۆزێتەوە، بەهۆی ئەوگالیسكەیەوە كە گەماڵەكان بەسەر بەفردا ڕایان دەكێشا. دیارە ئەو ئامانجە چەندین كەڵەپیاو هەوڵیان بۆدابوو، كەسانێكی زۆریش ئاواتیان بۆ خواست، بەڵام بەرلەوەی پێی شادبێن، مردن. بیریش خەریك بوو لەبرساندا بمرێت ولەسەرمادا ڕەق بێتەوە، هەشت دانە لەپەنجەكانی قاچی بونەسەهۆڵ ودواجار ناچاربوو بیان

بڕێتەوە.ئەوەندە نارەحەتی وسەختی هاتبویە ڕێ، پێی وابوو شێت دەبێت وناوەزی لەدەست ئەدات ئەوجا دەگەڕێتەوە.

سەرکردە دەریاوانەکان لەواشنتۆن، زۆر ڕقیان لێی دەبویەوە، چونکە دەیانزانی ئەوکاتێ دەگەڕێتەوە، جەماوەرێکی زۆری دەبێت.بۆیە تۆمەتباریان دەکرد بەوەی پارەوپول بۆ دۆزینەوەی زانستی کۆدەکاتەوە، دواتر بۆگەشتوگوزار بەو پارەیە دەچێت بۆ جەمسەری باکور.ڕەنگە خۆشیان باوەڕیان بەوتۆمەتە کردبێت، چونکە زۆر سەختە خۆت بڕوا بەشتێك نەکەیت و بتەوێت خەڵکی بڕوای پێ بکەن. بەم پێیە، زۆر بەتوندی پێداگری دەبینرا بۆسوکایەتی پێکردن وسەرشۆڕکردنی بیری... کارگەیشتە ئەوڕادەیەی (بیری) بەهۆی فەرمانێکی تایبەتی سەرۆك (ماکینلی) یەوە توانی پارێزگاری لەوەزیفەکەی بکات. ئایابیری دەبوەجێگەی سوکایەتی پێکردن، ئەگەر تەنها لەنێو نوسینگەکەی خۆیدا لەفەرمانگەی دەریاوانی واشنتۆندا دابنیشتایە؟ نەخێر.چونکە ئەوکات کارێکی وای نەدەکرد کەبیبێتە هۆی وروژاندنی ڕژدی!.

ژەنراڵ (گرانت) ئەزمونێکی خراپتری لەئەزمونەکەی ئەدمیراڵ (بیری) هەیە.لەساڵی١٨٦٢دا، ژەنراڵ (گرانت) سەرکەوتنێکی گەورەی وای بەدەست هێناکە لەماوەی شەو وڕۆژێکدا بویە قیبلەگای جەماوەر-سەرکەوتنەکەی تەنانەت لەئەورووپاش دەنگی دایەوە-سەرکەوتنێ بویەهۆی ئەوەی زەنگی کڵێساکانی بۆ لێ بدرێ ومەشخەڵەکانی ئاگریش هەڵبکرێن وهەرلەمانیەوە تاکو کەنارەکانی (میسیسیبی) ڕوناك بکەنەوە.لەگەڵ ئەوەشدا لەماوەی هەشت هەفتەی یەکەمی بەدەست هێنانی ئەوسەرکەوتنە مەزنەدا، ژەنراڵ گرانت، پاڵەوانەکەی باکور،

دەستگیرکرا و، سوپاکەیشی لێسەنرایەوە، بۆیە ژەنراڵیش، لەبەر بێ ئومێدی وئەوسوکایەتیەی پێکرابوو، تێرووپڕگریا.

ئایا بۆچی ژەنراڵ گرانت دەستگیرکرا، لەکاتێکدا ئەو لەترۆپکی سەرکەوتندابوو؟ لەبەر ئەوەگیرا، چونکە ڕژدی وڕقی ئەوانەی بزواندبوو کەلەخۆی بەرزتربوون.

جائەگەر بەهۆی ڕەخنەی نادادگەرانەوە قەڵس دەبیت، ئەوا کاریەم یاساکرداریە بکە:

لەبیرت بێت، ڕەخنەی دادگەرانە، موجامەلەیەکی شاردراوەیە...

لەبیریشت بێت، هیچ کەس پێلەقە لەسەگی تۆپیونادات.

# بەشی حەوتەم

## ئاوابکە، ڕەخنە ئازارت نادات!.

جارێك دیمانیەکم سازدالەگەڵ ماجۆر(ژەنراڵ سمیدلی باتلەر)سازدا، باتلەری خاوەنی دووچاری تیژو شەیتانەکەی دۆزەخ!وەبیرت دێتەوە کێیە؟ دەرکەوتووترین سەرکردەی مارینزی ئەمریکی.

باتلەر بۆی گێڕامەوە لەسەردەمی لاوێتیدا، بێ ئومێدانە تامەزرۆی ناوبانگ بوو، تامەزرۆی ئەوەبوو ئاسەوارێکی باش لەناخی هەموانـدا بەرانبەریـەخۆی دروست بکـات... لـەو ڕۆژانـەدا، بـچوکترین ڕەخنـە دەیگەیشت وئـازاری پـێ دەگەیانـد... وەڵێ دانیـشی بـەوەدانا کەخزمەتکردنی بۆماوەی سیی ساڵ لەنێو مارینزدا، بویەهۆی ئەوەی ببێتە پیاوێکی سەختگیر وتوند، لەوبارەیـەوەگوتی: (ببومەجێگـەی ڕەخنەوسـوکایەتی پێکـردن، وەکوماروسـەگی هـار ڕیـسوادەکرام... ڕۆژەکـان نەفرەتیان لێدەکردم وهێنـدەیان سەخڵەت دەکـردم وسیفاتی ناشیرینیان پێدا هەڵئەدام، کەبـەهیچ شێوەیەك مانایـان لەفەرهـەنگی زمـانی ئینگلیزیـدا نابینرێـت، چـونکە وشـەگەلێکی زۆرپـیس وخـراپ بـوون... وەڵێ ئایائـەو ڕەفتارانـەکاریان تێکـردم؟ نـەخێر.بەڵکوهـەرکاتێ

گوێبیستی سوکایەتیەك بومایە، ئاورِم نەدەدایەوەتاکوبزانم کێیەسوکایەتیەکەم پێ دەکات).

ڕەنگەخاوەنی دووچاوە تیژەکە.بایەخی بەرِەخنەگرتن نەدابێت، وەلێ زۆربەیخوڵك ئەوسوکایەتی وتۆمەتە پوچانە بەگرنگ دەگرن کەئاراستەیان دەکرێن. بیرم دێ چەندساڵێك لەمەوبەرجارێکیان پەیامنێری ڕۆژنامەی(نیویۆرك) هاتەنێویەکێك لەپۆلەکانمەوە ودواترهێرشی کردبویەسەر شێوازی وانەبێژی وفێرکاری من، ئایامن بەورِەخنانە تورِەبووم؟ ئەوەم بەسوکایەتیەکی شەخسیلەقەڵەمدا، بۆیە پێوەندیم بە(گیل هودجن)ەوەکرد، ئەم پیاوەسەرۆکی ئەنجومەنی جێبەجێکردنی ڕۆژنامەکەبوو، داوامڵیکرد وتارێك بڵاوبکاتەوە ڕاستیەکانی تێداباس بکرێ لەبری ئەوشتەپرِوپوچانەی لەرِەخنەی پەیامنێرەکەدا هاتبوون. بریارمدا سزاکە کتومت هاوتای تاوانەکەبێت.

ئێستاکەزۆر شەرم لەورِەفتارەم دەکەم.چونکە دەزانم نیوەی ئەوکەسانەی ڕۆژنامەکەیان کرِیوە، ئەو وتارەیان نەبینیوە.نیوەی ئەوانەش کەوتارەکەیان خوێندۆتەوە بەگاڵتەوسوعبەتیان زانیوە.هەرکەسیش بەوردی خوێندبێتیەوە چەند هەفتەیەك دواتر هیچی لەو وتارە لەبیرنەماوە.هەنوکە دەزانم، خەڵکی نەبایەخ بەتۆدەدەن ونەبەمن، نەبایەخ بەوەش ئەدەن کەلەبارەی من وتۆوە دەگوترێت.ڕۆژتائێوارە بیرلەخۆیان دەکەنەوە.بەڵکو تانیوەی شەوبیرلەخۆیان دەکەنەوە... بگرەبیرلە ژانەسەرێکی خۆیان دەکەنەوە، هەزارئەوەندەی کەبیرلەمردنی تۆ ومردنی من دەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر چاوبەستیشیان لێ بکرێت ودرۆ ودەلەسەمان بۆدروست بکرێت

ونزیکترین هاوڕێشمان لەپشتەوە خەنجەرمان لێ بدات.بالەپیاهەڵدانی خۆمان دووربکەوینەوە.لەبری ئەوەنمونەی سوکرات بێنینەوەکەنیوەی ڕێکی قوتابیەکانی لەکاتی دادگایی کردنەکەیدا لێ هەڵگەڕانەوە وتۆمەتباریان کردبەوەی کەگەنجەکانی ئەسینا تێک ئەدات بەوبیر وبۆچونانەی کەبڵاویان دەکاتەوە.لەئەنجامدا سزای مەرگیان بەسەردا سەپاند بەخواردنەوەی ژەهری تێکەڵکراو بەهەنگوین... ئەوپیاوە هەرلەدووهاوڕێی، یەکێکیان لێیهەڵگەڕانەوە وخیانەتیان لێکرد.

ئایائێمە چاوەڕوانی ڕێژەیەکی باشتردەکەین؟

چەندساڵێك ئەوەم بۆ ڕوون بۆتەوەکەهەرچەندە من ناتوانم خەڵکی دووربخەمەوە لەوەی ڕەخنەی نابەجێ ونادادگەرانەم لێبگرن، بەڵام دەتوانم کارێکی تربکەم کەلەوکارەی پێشو کەم بایەخترنیە: دەتوانم خۆم بڕیاربدەم لەسەر ئەوەی ئایا ڕێگە ئەدەم ڕەخنەی نابەجێ کارم لێ بکات یان نا؟ .

بالەوڕووەوە کەمێك ڕونتر بدوێین: من پێم باش نیەهەموو جۆرە ڕەخنەیەك پشتگوێ بخرێت.تەنهاباس لەفەرامۆشکردنی ڕەخنەی پڕوپوچ دەکەم... جارێکیان لە(ئیلیانۆر ڕۆزڤلت)م پرسی، ئایاتۆچۆن چارەسەری ڕەخنەی پوچ دەکەیت-چونکە خوادەیزانێ ئەم پشکی زۆری لەڕەخنەی پوچ بەرکەوتووە، ڕەنگە لەهەر ئافرەتێکی ترکەلەنێوکۆشکی سپیدا ژیابێت، زیاترهاوڕێی دڵسۆز ودوژمنی سەرسەختیشی هەبێت.

لەوەڵامدا باسی ئەوەی بۆکردم کەلەسەر دەمی لاوێتیدا، زۆرشەرمن بوە، هەروەها زۆریش دەترسالەقسەی خەڵك.لەڕەخنەگرتن دەترسا.تەنانەت جارێکیان داوای لەخوشکەکەی تیۆدۆر ڕۆزڤلت کرد

ئامۆژگـاری بکـات وگـوتی: (پـوریٚ گیـان، دەمــەویٚت فلانــەکار یـان فیسارەکاربکەم، بەڵام لەڕەخنەدەترسم).

پوریٚ سەرنجێکی چاوەکانیدا وپاشان گوتی: (مادەم بڕوای تەواوت هەبێت بەوەی لەسەرهەقیت، ئیدی گویٚ بەوەمەدەخەڵکی چی دەڵێن)... ئیلیـانۆر ڕۆزڤلـت باسـی ئـەوەی بـۆکردم کەلەسـالأنی داهـاتوودا ئـەم ئامۆژگاریە بۆ ئەم بویە تاوێرەکەی جیبرلتار... پاش چەند ساڵێك ژیان لەکۆشکی سپیدا، پێی گوتم باشترین ڕێگە بۆ دوورکەوتنەوە لەڕەخنە، ئەوەیـە کـە وەك پەیکـەری (درسـۆنی چـینی) وابـین کەلەسـەر ڕەفـە دادەنـریٚ... هەمیشە دەیگـوت: (مـادەم بـاش دەزانیـت کـەخۆت لەسـەر هەقیت ئـەوا هەرچیت دەویٚ بیکـە، چونکە هەرچۆن بیت هەرڕەخنـەت لیٚ دەگیریٚت).

(ماسـیۆس بـراش) سـەرۆکی کۆمپانیایـەکی ئـەمریکی نێودەوڵـەتی بووله(وۆلٚ ستریت). پرسیارم لیٚکرد ئایا هەستیارە بەرانبەر ڕەخنە یان نا؟ لەوەڵامدا گوتی: (بـەڵیٚ، لەهـەرەتی لاوێتیدا زۆر هەستیاربووم بەرانبەر بەڕەخنـە. هـەوڵم زۆر ئـەدا بۆئـەوەی هـەموو کـەس بزانێـت مـن پیـاوێکی تێروتـەواوم، ئەگـەر وانـەبا، خەفـەت ودوو دڵـی دایـان دەگـرتم. تەنانـەت هـەوڵم ئـەدا ئەوکەسـانە قایـل بکـەم کـەوەك نـەیار دەهاتنـە بەرچاوم. وەلیٚ هەرکەلەوهەوڵانەم تەواو دەبوم، ڕق وخەشمی مرۆڤێکی ترم بزواندبوو. کە لەگەڵ ئەویشدا کێشەکەم چارەسەردەکرد، دەمبۆڵە وپرتەوخورتەی کەسێکی ترم لێوە دەئالأ.

بۆیـە بۆم دەرکـەوت هەرچەندە ساڕێژی برینیٚ بکەم بۆئەوەی بتوانم لەڕەخنەگرتن هەڵبێم، ئەوەندەش دژمنەکانم پتردەبن. بۆیە بەخۆمم گوت:

(ئەگەر سەریشت بەرزکەیتەوە بەسەرجەماوەردا، ئەوا ڕەخنەت لێ دەگیرێت، کەواتە خووبەم بیرۆکەیەوە بگرە)... ئەمەش یارمەتیەکی زۆریدام، لەوکاتەوە، ئەم ڕێسایەم بۆخۆم هەڵبژارد، کاروکۆششی خۆم دەکەم، دواتر چەترەکۆنەکەم بەسەرخۆمەوە دەگرم تاکوڕەخنەکان لەسەری هەڵبخزێن، لەبری ئەوەی دابارێنە سەرئەستۆ وگەردنم)!.

(دیمزتایلۆر) لەوسنورەش زیاتر دەڕوات: ئەم ڕێگەی ئەدابارانەکانی ڕەخنە دابارێنە سەری وشۆڕببنەوە بەنێو ئەستۆو گەردنیدا، دواتریش لەبەردەم هەمواندا گاڵتەی بەڕەخنەکان دەکرد!!لەدوانیوەڕۆی ڕۆژێکی یەکشەممەدا کاتێ بەرنامەی مۆسیقای پێشکەش دەکرد، نامەی ئافرەتێکی پێی گەیشت کەبە(درۆزن و، بەکرێ گیراو و، مار) لەقەڵەمی دابوو.بەڕێز تایلۆر لە کتێبەکەیدا(سەبارەت بەپیاوەکان ومۆسیقا)دەڵێت: گومانم وایە ئەو ئافرەتە هیچ گوێی بەقسەکانم نەداوە.

لەهەفتەی داهاتوودا، بەڕێزتایلۆر لەڕادیۆوە نامەی ژنەکەی خوێندەوە وداى بەگوێیملیۆنەها کەس لەگوێگرەکانی ڕادیۆدا... کەچی پاش چەندڕۆژێکی کەم هەمان خانم نامەیەکی تری بۆنوسیبویەوە وهەمان ڕای پێشوی خۆیی سەبارەت بەتایلۆ دووبارە کردبویەوە کەبەدرۆزن وبەکێگیرا و وماری لەقەڵەم دابوو. دەبێ ئێمە ڕێزبگرین لەهێوری وهاوسەنگی وسنگ فراوانی ئەوپیاوە لەکاتی ڕەخنەلێگیرانیدا!!

لەکاتێکدا (چارلزشواب) وتاری بۆئەنجومەنی قوتابیان ئەدالەبرینستۆن، باسی ئەوەی بۆکردن کەگرنگترین وانەی ژیانی لەپیاوێکی پیری ئەڵمانیەوە فێربوە کەلەکارگەی پۆڵاسازی شوابدا کاری دەکرد.ئەوپیاوەپیرە توشی شەڕەقسەیەك بوولەگەڵ کرێکارەکانی تردا،

کارگەیشتە ئەوەی پیاوەپیرەکەیان خستەناورووبارەکەوە. بەڕێزشواب دەڵێت: (کەئەوپیاوەهات بۆنوسینگەکەم هەمووگیانی هەڵژنرابوو لەقوڕاو، پرسیاری ئەوەم لێکرد کەناخۆچیت بەوکرێکارانە گوتووە، توڕیان داویتە ناورووبارەکەوە، لەوەڵامداگوتی: (تەنها پێکەنیوم!)... دواجار بەڕێزشواب قسەی پیاوە پیرەئەڵمانیەکەی کردۆتە دروشم: (تەنهاپێبکەنە).

ئەگەربوبیتە قوربانی ڕەخنەگرتنی پوچ، ئەم دروشمە زۆر بەسودە بۆت... ئاخەر تۆدەتوانیت وەڵامی کەسێك بدەیتەوە کە ئەویش وەڵامت بداتەوە، بەڵام دەتوانیت چی بڵێیت لەگەڵ کەسێکدا کە(تەنهاپێ بکەنێت)؟ .

(لنکۆڵن) خەریك بوو بپروکێت لەژێرباری قورسی جەنگی‌ناوخۆیدا ، ئەگەر فێرنەبوایە چۆن چۆنی وەڵامی ڕەخنەی تیژوبریندارکەر بداتەوە... شێوازی چارەسەرکردنی ئەم بۆ ئەوڕەخنە توندوتیژانەی ئاراستەی دەکران، دواتربویە دروشمێك وهەموان کاریان پێ دەکرد، تەنانەت ژەنراڵ (ماك ئارسەر) کۆپییەك لەودروشمەی لەماوەی جەنگدا بەنوسینگەکەی خۆیەوە هەڵواسیبوو.هەروەها (لۆنستۆن چەرچڵ)یش، کۆپیەکی لەهەمان دروشم لەنێو چوارچێوەیەکدا لەنوسینگەکەی خۆی لە (چارتۆبڵ)دا هەڵواسیبوو... تیایدا هاتبوو: (ئەوپەڕی هەوڵ وکۆششم بەکاردەهێنم، جائەگەر ئەنجامەکەی باش کەوتەوە، ئیدی گوێ نادەم بەوەی لەدژم دەگوترێت.ئەگەر ئەنجامەکانیش هەڵەبوون، ئەوا ئەگەر دەدانەفریشتەش سوێند بخۆن کەکارێکی ڕاستم کردبوو، هەرهیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت).

كاتێ دەبینە جێگەی ڕەخنەلێگرتنی پوچ، باشەم ڕێسایەمان لەبیربێت: هەموو هەوڵ وتوانای خۆت بەكاربێنە، دواترچەترەگۆنەكەت بەسەرتەوە هەڵبدە، بابارانی ڕەخنەكان بەسەریدا هەڵبخزێت ودانەبارێتە سەر شان وئەستۆت.

## دەروازەی دووەم

## ڕێگەسەرەکیەکانی هەڵس وکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا.

(چۆن هاوڕێ ودۆست پەیدادەکەیت وکاریگەری لەسەر خەڵك دادەنێت) پەرتوکێکە سەبارەت بەپەیوەندیە مرۆییەکان-سەبارەت بەهەڵس وکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا، هەروەهاسەبارەت بەپێویستی بونی دۆست وهاوڕێ تاکوژیانێکی تێروتەواو بژین.

بەرهەڵستی کردنی ئارەزووی ڕەخنەگرتن وبەدەست هێنانی نەریتی ستایش کردنی دڵسۆزانە، کاریگەری مەزنی هەیەلەدڵ ڕاکێشانی ئەوانی تردا... هەروەها ئەوشتانەش کەلەجیهاندا خۆشحاڵ وبەختەوەرمان دەکەن، هەمان ئەوشتانە لەماڵەوەش بەختەوەرمان دەکەن... کەواتە مەسەلەگەلێکی گرنگن بۆهەموو پیاو وئافرەتێك.

# بەشی هەشتەم

## ئەگەر ئەتەوێت هەنگوین کۆبکەیتەوە، شانەی هەنگەکە مەجوڵێنە.

لە٧/٥/١٩٣١دا شاری نیویۆرک گەورەترین کردەوەی ڕاوەدونانی بەخۆیەوە بینی، ئەوەبوو پاش چەندهەفتەیەک گەڕان و پشکنین، توانرا تاوانبار کراولی (کەناسرابوو بەجووت دەمانچە)لە باڵەخانەی کچە هاوڕێکەیدا لەشەقامی (وێست ئەند)دادەستگیربکرێت.

سەدوپەنجاکەس لەپیاوانی پۆلیس، گەمارۆی باڵەخانەکەیان داوهەوڵیاندابانی خانوەکە کون بکەن وگازی فرمێسک ڕێژی لێوەبکەنەژورەوە، جگەلەوەش لولەی تفەنگەکانیان کردبویە باڵەخانەکانی دەوروبەریش، بۆماوەی زیاتر لەکاتژمێرێک، جوانترینی باڵەخانەکانی نیویۆرک بونە ئامانجی تفەنگەکان کراولیش بەڕۆڵی خۆی لەپشتی کورسیەکەوە خۆی حەشاردابوو، تەقەی لەپیاوانی پۆلیس دەکرد.دەهەزارکەس ئەم جەنگەیان بینی شەڕێکی بەوشێوەیە پێشتر لەسەر شۆستەکانی نیویۆرکدا نەبینرابوو.

لەپاش ئەوەی کراولی دەستگیرکرا، مفەوەزی پۆلیس (مالرۆنی) رای گەیاند.کراولی (ناسراوبە جووت دەمانچە) یەکێك لەو هەرە ئەوتاوانبارانەی کەمێژوی نیویۆرك بەخۆیەوە بینیبونی.

بەلام ئایا کراولی خۆی بەچی لەقەڵەمئەدا؟ ئێمەدەزانین لەکاتێکدا پۆلیس گوللەی دەنابەباڵەخانەکەیەوە، ئەونامەیەکی نوسیبوو بۆ(هەرکەسێ بایەخ بەومەسەلەیە ئەدا) لەکاتی نوسینی ئەونامەیەدا، خوێنی زامەکانی دەتکایەسەرلاپەڕەکە.کراولی لەونامەیەدا دەڵێت: (لەناخمدا دڵێکی پەژموردەهەیە، بەلام دڵێکی ناسکە، دڵێکەئازاری کەس نادات).

کەمێك بەرلەو رووداوە وبەرلەنوسینی ئەونامەیەش، کراولی لەگەڵ هاوڕێکەیدا لەسەر ڕێگەی (لۆنگ ئایلەند)دانیشتبوو، لەناکاو چاوی بەپۆلیسێك دەکەوێت.پۆلیسەکە ئۆتۆمبیلەکەی دەوەستێنێت وپێی دەڵێت: (مۆڵەتی شۆفێریەکەتم پیشان بدە).

کراولی بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، دەمانچەکەی ڕادەکێشێت وڕێژنەیەك گوللەبەپۆلیسەکەوە دەنێت.لەپاش ئەوەی پۆلیسەکە دەمرێت.کراولی لەئۆتۆمبیلەکەی دێتەدەرەوە ودەمانچەی پۆلیسەکە ڕادەکێشێت وچەندفیشەکێك دەنێت بەورگی تەرمەکەوە.ئەمەش ئەو پیاوکوژەیە کەدواتر لەنامەکەیدا دەنوسێت: (لەناخمدا دڵێکی پەژموردەهەیە، بەلام دڵێکی ناسکە، دڵێکە ئازاری کەس نادات)!.

سزای مەرگ، لەڕێی کورسیەکی کارەباییەوە بەسەر کراولیدا سەپێنرا، کاتێکیش گەشتە ئەوجێگەیەی سزاکەی تێدا جێبەجێ دەکرالە(سیگ

سیگ) ئایا گوتی: (ئەوەی بەسەرمدا هاتووە ئەنجامی کوشتنی خەڵکە؟)
نەخێر، بەڵکوگوتی: (ئەمە سەرەنجامی بەرگری کردنمە لەخۆم)!!.

مەبەست لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە ئەوەیەکە تێ بگەین لەوەی خاوەنی جوت دەمانچە(کراولی)بەهیچ جۆرێ لۆمەی دەرونی خۆی نەدەکرد.جائایا ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە شتێکی نائاساییە لەنێو تاوانبارانداا؟ ئەگەر بڕوات وایە، ئەوابفەرموو، ئەم بەسەرهاتەی تریش بخوێنەرەوە:

(زۆربەی ساڵەکانی ژیانم لەگەیاندنی خۆشی بەدڵی خەڵکیدا بەسەربرد، لەیارمەتی دانی خەڵکیدا بۆئەوەی کاتەکانی ژیانیان بەچێژو خۆشیەوە بەسەربەرن، لەئەنجامیشدا تەنها سوکایەتیم پێکرا).

بێژەری ئەم قسەیەش (ئال کابۆنی)ە، کەسەرسەخترین دوژمنی ئەمریکا وسەرکردەی مەترسیدارترین باندیش بوولەشیکاگۆدا.ئال کابۆنی رەخنەلەخۆی ناگرێت، بەڵکوخۆی بەسودبەخش دەزانێت، بەڵام لەهەمان کاتدا خۆیشی بەوەدەزانێت کەهیچ کەسێك ڕێزی لێناگرێت ولێی تێ ناگات.

(داچ شۆڵتز)یش بەرلەوەی بەگوللەی باندەکان لەنێوئارکدا بتلیسێتەوە لەچاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنوسیدا باس لەوەدەکات کەخۆی بەوەدەزانێت سودێکی گشتی هەبێت.بڕوایشی پتەوەبەوەی کەخۆی کەسێکی بەسودە.

سەبارەت بەم بابەتە پێوەندی گەلێکی سەرنج ڕاکێشم گرێدا، لەگەڵ بەرپرسی زیندانی سینگ سینگدا، ئەوبەرپرسەش باسی ئەوەی بۆکردم کەژمارەیەکی زۆرکەم لەتاوانبارە دەستگیرکراوەکانی زیندانی سینگ

سینگ خۆیان بەکەسێکی خراپ وتاوانبار دەزانن.ئەوانیش وەکومن وتۆمرۆڤن، پاساوی هەڵوێستەکانی‌خۆیان دەدەن وبارودۆخی خۆیان ڕون دەکەنەوە. دەتوانن پێت بڵێن کەلەپای چی میلی تفەنگەکان ڕادەکێشن وگوللە دەتەقێنن.زۆربەشیان هەوڵ ئەدەن، لەڕێگەی دانایی ولۆژیکەوە کردەوە نایاساییەکانیان پاساوبدەن، تەنانەت دێن کردەوەکانیان بۆخۆیان پاساوئەدەن وبەوپێیەش دەگەنە ئەوبڕوایەی کەبڵێن پێویست نیەزیندانی بکرێت).

جاتەگەر ئال کابۆنی وجوت دەمانچە وداچ شۆڵتز، ئەوپیاوە بەدکار وبێ ئومێدانەی کەلەپشتی شیشەکانی زیندانەوە بوون، سەرزەنشتی خۆیان نەکەن لەبەرانبەر کردەوەکانیاندا، ئەبێ ئەوکەسەئاساییانە چۆن بن کەڕۆژانە ڕوبەڕویان دەبینەوە؟ .

جارێکیان (ژۆن واناماکیر) دان بەڕاستیەکدادەنێت ودەڵێت: (سێ ساڵەتێ گەشتوم کەنیگەران بوون بێ ئەقڵیە، چونکە ئەوەندەم سەرقاڵی هەیە کەلەتوانای خۆم بەدەرە.بشزانەکەخودا سیفەتی زیرەکێتی بەشێوەیەکی یەکسان دابەش نەکردووە).

(واناماکیر) لەزووەوە ئەووانەیە فێربوو، وەڵ من قەدەرم وابوو بەدرێژایی سێ‌یەکی سەدەیەک لەم جیهانەدا بژیبم، بەرلەوەی بۆم ڕوون بێتەوە کە(٩٩٪)ی‌خەڵکی هەرچەندە هەڵەکانیان گەورەبێت، هێشتر ئامادەنین ڕەخنەلەخۆیان بگرن.

ڕەخنەگرتن کوشندەیە، چونکە مرۆڤ دەخاتەحاڵەتی بەرگریەوە، هەرچی نەریتیشە وای لێدەکات پاساوی کارەکانی خۆی بدات.ڕەخنەگرتن مەترسیدارە، چونکەکیبریای مرۆڤ بریندارەدەکات

وئـازاریش دەگەیـەنێت بەهەسـتکردنی بەبایـەخی خـۆی!!جگەلـەوە دەبێتەهۆی نیگەران بون وبێ ئومێدبونیشی.

سوپای ئەڵمانیاڕێگەنادات هیچ کام لەسەربازەکانی ڕاستەوخۆ دوای ئـەوەی گرفتێکـی بۆدێتەپێـشەوە، سـکاڵابەرزبکاتەوە یـان ڕەخنـەبگرێت.بەڵکوپێویـستە بەسـەر برینەکەیـدابنوێت تـاکو هێوردەبێتـەوە.هەرسـەربازێك ڕاستەوخۆسـکاڵابکات، سـزانەدرێت.پێویـستە لـەژیانی مەدەنیـشدایاسایەکی هاوشێوەدابنرێت.یاسایەك بۆئەوانـەی سەرزەنشت ئەکـەن وئەوژنانـەی زۆرسکاڵادەکەن وهەموو ئەوانەش، کەبەدوای هەڵەدادەگەڕێن.

دەتوانیـت نمونەگـەلێکی زۆربخوێنێتـەوە سـەبارەت بەڕەخنـەگرتنی کوشـندە، چـونکەئەونمونانەلاپەڕەکانی مێـژویان پڕکـردوە.بۆنمونـە سـەرنجی ئەوناکۆکیـە بەناوبانگەبـدە کەکەوتـەنێوان تێـودۆر ڕۆزفلت وسەرۆك تافتەوە-ئەوناکۆکیەی کەبویەهۆی لێك ترازانی ئەوپەرلەمانەی کەلەکۆماریـەکان پێـك هـاتبوو، لەئەنجامیـشدا(ودۆر وێڵـسۆن) یهێنایەکۆشکی سپیەوە...

بابەپەلە بەسەر ڕاستیەکاندا بچینەوە: کەلە ١٩٠٨دا تێۆدۆر ڕۆزفلت لەکۆشکی سپی چوە دەرەوە، تافتی کردەسەرۆك وخۆی ڕۆشت بۆڕاوی شـێرلەئەفریقیا.کاتـێ گەڕایـەوە، زۆربەتونـدی ڕەخنەیلەوشـکی وتـەزەموتی تافت گـرت وهەوڵیدابونی خۆی بۆجاری سێیەم لەکۆشکی سپیدا مسۆگەربکات. ئەوەبوو پارتی کۆماری ئەمریکای هەڵوەشاندەوە وپارتێکی تری بەناوی ( bull moose)ەوە دامەزراند.لەهەڵبژاردنەکەی دوای ئـەو ڕوداوە، ولیـەم هواردتافـت وپـارتی کۆمـاری هـیچ

سەرکەوتنێکیان بەدەست نەهێناجگەلە بەدەست هێنانی ویلایەتەکانی (فیرمۆنت وئۆتاوا). ئەمەش گەورەترین شکست بوو کەمێژووی پارتی کۆماری ئەمریکا بەخۆیەوە ببینێت.

تیۆدۆر ڕۆزڤلت لەپای ئەم شکستەدا سەرزەنشتی تافتی کرد. بەڵام ئایاسەرۆك تافت لۆمەی خۆیی کرد؟ بێگومان نەخێر. بەڵکو بەدەم قوڵپی گریانەوە گوتی: (نازانم غەیری ئەوەی کەکردم دەبوا چیم بکردایە. کەواتە ئەبێ لۆمەی کێ بکرێت؟ ڕۆزڤلت یان تافت؟ بەڕاشکاوی من وەڵامی ئەم پرسیارەنازانم. تەنانەت گرنگیشی پێ نادەم... بەڵکو هەوڵ ئەدەم ئەوەڕون بکەمەوە کەڕەخنەکانی ڕۆزڤلت نەبوونەهۆی ئەوەی کەتافت بڕوابکات بەوەی خۆی بەهەڵەداچووە. بەڵکو ڕەخنەکان پاڵیان بەتافتەوەنا، بۆئەوەی پاساوی هەڵوێستی خۆی بدات وبەدەم. گریانەوە بڵێت: (نازانم غەیری ئەوەی کردم، دەبواچی دیکەم بکردایە).

لەم جۆرەهەڵوێستانەدا، سروشتی مرۆیی دەست لەکایەکە وەرئەدات، بابای هەڵەکاریش لۆمەی هەموان دەکات جگەلەخۆی: ئێمەهەمووما‌ن واین. کاتێ ئارەزوی ڕەخنەگرتن لەکەسێك دەکەین، بابیرلەئال کاپۆنی وجوت دەمانچە وسەرۆك تافت بکەینەوە. بائەوەمان لەیادبێت کەڕەخنەگرتن وەکوکۆتری ماڵیکراووایە، لەهەمووکاتێکدا دەگەڕێتەوە بۆسەرچاوەکەخۆی. ئەوکەسەش کەئێمەهەوڵ ئەدەین چاکی بکەین وڕەخنەی لێبگرین، پاساوی هەڵوێستەکانی خۆی ئەدات وتەنانەت ڕەخنەش لەئێمە دەگرێت!!.

سەرلەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە، ڕێکەوتی ١٨٦٥/٤/١٥، ئیبراهام لنکۆڵن لەسەرجێگەی مەرگ کەوتبوو، لەڕۆژێکی ناخۆش وناشایستەدا،

ژوورەكە دەكەوتەسەر ئەوشەقامەی كەلەشانۆی (فۆرد) جیادەبویەوە...
لنكۆڵن لەسەردۆشەكێك كەوتبوو كەلەباڵای ئەوكورت تربوو.بەدیواری ژورەكەیشەوە وێنە بەناوبانگەكەی ڕۆزابنهاور (ئەسپەجوانەكە- the horse fair) و ڕوناكیەكی زەردی هێوریش دەبینرا.

لەوساتانەدا كەلنكۆڵن هەناسەكانی سەرەمەرگی ئەدا، سكرتێری وەزارەتی جەنگ گوتی: (لێرەدا یەكێك لەوپیاوە هەرەكامڵەكان هەڵاژیاوە، كەجیهان ناسیونی).

ئایانهێنی سەركەوتنی هەڵس وكەوتی لنكۆڵن لەگەڵ خەڵكیدا چی بوو؟ من بۆماوەی دەساڵ لەژیانی لنكۆڵن كۆڵیمەوە، سێ ساڵیشم تەرخانكردبۆدانانی پەرتوكێك بەناوی (لنكۆڵنی نادیار).پێم وایە توێژینەوەیەكی وردم سەبارەت بەكەسایەتی لنكۆڵن وژیانی خانەوادەیی ئەو ئامادەكردووە، هەروەها هەستام بەلێكۆڵینەوەی شێوازی مامەڵەكردنی لنكۆڵن لەگەڵ خەڵكیدا.

جائایا لنكۆڵن پەنای دەبردەبەر ڕەخنەگرتن؟ بەڵێ.لەسەردەمی لاوێتیدا لەدۆڵی (بیگۆن كریك)لەئینندیانا، نەك هەر ڕەخنەی دەگرت، بەڵكوهۆنراوە ونوسینی هەبووكەتیایدا گاڵتەی بەخەڵكی دەكرد.ئەونوسراوانەیشی دەخستەسەر ڕێگەسەرەكیەكانی شارۆچكەكە، بۆئەوەی بەئاسانی خەڵك چاویان بەنوسراوەكان بكەوێت وهەڵیان بگرنەوە وبیان خوێننەوە.یەكێك لەونامانەش بونەهۆی نیگەرانیەك كەبەدرێژایی ژیانی پێیەوەچەسپی بوو. تەنانەت كاتێكیش لە(سپرینگ فیلد) ی ویلایەتی (ئیللینوا)دا بویەپارێزەر، بەشێوەیەكی ئاشكراهێرشی دەكردە سەرنەیارەكانی لەڕێگەی ئەونامانەوەكە لەڕۆژنامەكاندا بڵاوی

دەکردنەوە.لەپایزی ١٨٤٢دا، ڕەخنەی لە(جیمس شیلدن) گرت کەسیاسەتمەدارێکی ئیرلەندایی بوو.لەڕێی نامەیەکی ئاشکراشەوە کەلەڕۆژنامەی (سپرینگ فیلد)دا بڵاوی کردەوە هێرشی کردەسەری.هەموو خەڵکی ئەوشارە بەهۆی ئەوهێرشەوە دەستیان بەپێکەنین کرد.بەڵام ئەوکابرایەی کەهێرشی کرابویەسەر، نوسەری نامەکەیی دۆزیەوە، سواری ئەسپەکەی بوو، دەستی کردەگەڕان بەدوای لنکۆڵندا، داوای کردلەگەڵیدا بجەنگێت.هەرچی لنکۆڵن بوو نەیدەویست شەڕبکات، بەڵکو ناچار بەشەڕکردن کرا، لەبەر ڕێز وحورمەتی خۆیشی نەیدەتوانی خۆی لەوشەڕە بدزێتەوە. کاتێ چەکی ئەوشەڕەدەست نیشانکرا، شمشێری پانی هەڵبژارد، چونکە دوودەستی درێژی هەبوو، وانەی شەڕەشمشێریشی لە(ئەلۆست پۆنیت) خوێندبوو.

لەڕۆژی دیاریکراودا، لەگەڵ شیلدزدا لەکەناری ڕوباری میسیسیبی بەیەک گەیشتن وئامادەبوون بۆشەڕکردن تاکو یەکێکیان ئەویتریان دەکوژن.بەڵام لەدوای چرکەکانی ئەم ئامادەسازیەدا ئەوانەی لەگەڵیابوون نەیان هێڵاشەڕەکە بکەن.

ئەم ڕوداوە لەژیانی لنکۆڵندا، دزێوترین وناخۆشترین ڕوداوبوو.هەرئەم ڕووداوە، وانەیەکی بەپێزی سەبارەت بەمامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا فێری لنکۆڵن کرد.لەپاش ئەو ڕووداوە، نامەی گاڵتەئامێزی نەدەنوسی وگاڵتەیشی بەکەس نەدەکرد، تەنانەت لەدوای ئەوڕووداوە هەرگیز ڕەخنەی لەکەس نەدەگرت.

لەماوەی شەڕی ناوخۆدا، هەرجارناجارێ لنکۆڵن کەسێکی دەست نیشان دەکردبۆسەرکردایەتی کردنی سوپای (بۆتۆماك).هەر یەکێك

لەوانەش- هەرلەماکیلانەوە بیگرە تابەلۆپ و، برنساید، هۆکرمیدی دەگات-بەڕۆڵی خۆی هەڵەی گەورە گەورەی دەکرد ئەم مەسەلەیەش لنکۆلنی بێزارکردبوو.کار گەشتبوە ئەوەی نیوەی دانیشتوانی وڵات ڕەخنەیان لەوسەرکردانە دەگرت. بەڵام لنکۆلن لەبەرئەوەی هەموانی خۆش دەویست وهەستی بەدژایەتی کردن لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەدەکرد.بەردەوام هێمن بوو. کاتێ هاوسەرەکەیشی بەزمانێکی ڕەق باسی دانیشتوانی باشوری کرد. لنکۆلن لەوەلامدا گوتی: ڕەخنەیان لێ مەگرن، ئەگەر ئێمەش لەبارودۆخەکەی ئەواندا بژیاینایە، وەکو ئەوان دەبووین).

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر هەرپیاوێك بوارێکی هەبوبێت بۆڕەخنەگرتن، ئەوە لنکۆلن خۆی بوە.بالەم ڕووەوە ئەم نمونەیە سەیریکەین: لەسێ ڕۆژی سەرەتای مانگی تەمموزی ساڵی ١٨٦٣ داشەڕی (گیتسبۆرگ)ڕوویدا.شەوی چوارەمی شەڕەکە (لیی) دەستی کردە پاشەکشەکردن وگوریزدان بەرەو باشور، لەوکاتەدا هەوریەری ئاسمانی گرتبوو، هەڕەشەی باران بارینی دەکرد.ئەودەمەی(لیی)بەخۆی وسوپاشکست خواردوەکەیەوە گەشتە (بۆتۆماك).بینی ڕووبارێکی زۆرگەورە لەبەردەمیاندایە و ناتوانن لێی بپەڕنەوە، سوپای یەکێتیش کەسەرکەوتوی جەنگەکە بوون لەپشتیانەوە دەهاتن.(لیی) کەوتەنێو تەڵەکەوە و نەیتوانی ڕابکات.لنکۆلن پێی وابوونێستا هەلێکی زێڕینەبۆ دەستگیرکردنی لیی ولەناوبردنی سوپاکەی وکۆتایی هێنان بە جەنگەکە بەشێوەیەکی خێرا.

بەوشێوەیە ولەمیانەی ئەم شەپۆلەگەورەی ئومێددا، لنکۆڵن فەرمانی
بە(میدی) تاکو ئەنجومەنی جەنگ بانگهێشت نەکات، بەڵکو دەست بەجێ
هێرش بکاتە سەر(لیی).لنکۆڵن ئەم فەرمانانەی دەرکرد، پاشتریش
نێردراوێکی تایبەتی ناردە لای (میدی) وداوای لێکرد دەست بەجێ
بەوکارەهەستێت.

ئەی ژەنراڵ میدی چی کرد؟ بەپێچەوانەی فەرمانەکانەوە ڕەفتاری
کرد.فەرمانەکانی لنکۆڵنی پێشێل کرد. بانگهێشتی ئەنجومەنی جەنگی
کرد کۆببنەوە.چەندین پاساوی هێنایەوە وهێرش کردنەسەر(لیی) ڕەت
کردەوە.دواجاریش، ئاستی ئاوەکە دابەزی، لیی توانی بەخۆی
وسوپاکەیەوە بگاتە بۆتۆماك.

لنکۆڵن تورەبوو، بەتورەییەوە هاواری کردلە ڕۆبەرتی کوڕی:
(توخوانەوە مانای چی؟ دەمانتوانی لەناوی بەرین، بەڵام فەرمانەکانم
نەیانتوانی‌سوپاکە ببزوێنن.لەم جۆرە بارودۆخانەدا، هەرسەرکردەیەك
بگری دەتوانێ لیی ببەزێنێت.ئەگەر من لەوێ بومایە، هەربەتەنها خۆم
دەمبەزاند" دەربڕینی وەرگێڕ" ... لەوکاتەدا کەهەستی بەنیگەرانیەکی
قوڵ دەکرد لە بەرانبەر (میدی)دا، نامەیەکی نوسی بۆمیدی (لەبیرت بێ
لەوماوەیەدا لنکۆڵن تەواو خۆپارێزوژیربوو)... ئەونامەیە کەلە١٨٦٣دا
نوسیویەتی بەنامەیەکی ڕەق وسەرزەنشتکاردێتە ژماردن..لەنامەکەیدا
دەڵێت:

"سەرکردەخۆشەویستەکەم"،

پێم وانیە تۆمەزەندەی ئەوبەدبەختیە بکەیت کەبەهۆی هەڵاتنی لییەوە
بەرۆکێ پێ گرتین، ئێمە خەریك بوو دەستگیری بکەین.ئەوەش دەچوە

سەرسەرکەوتنەکانی پێشومان وکۆتایی بەجەنگەکە دەهێنا.وەڵێ ئێستا، جەنگ بۆماوەیەکی نادیار درێژەدەکێشێ.ئەگەر ڕۆژی دووشەممەی ڕابردوو نەتتوانی هێرش بکەیتە سەر لیی. ئەی لەباشوری ڕوبارەکەدا چۆن دەتوانیت هێرش بکەیتەسەری لەکاتێکدانەتوانیت سێ یەکی ئەوهێزانە لەڕوبارەکە بپەڕێنیتەوە کەپێشتر لەگەڵت بوون... بۆیە شتێکی ناماقوڵە چاوەڕوانی سەرکەوتن بکەیت.چونکە هەلی زێڕینت لەدەست دەرچوو.منیش بۆئەو دەرفەتەی لەکیسمان چوو، زۆر نیگەران وخەمبارم).

ئەی پێت وایە (میدی) کاتێ نامەکەی خوێندەوە چی کرد؟ لەڕاستیدا میدی نامەکەی نەخوێندەوە، چونکە لنکۆڵن نامەکەی بۆ نەنارد، بەڵکوئەم نامەیە لەدوای کۆچی دوایی لنکۆڵن، لەناونوسراوەکانیدا دۆزرایەوە!!.

بەبڕوای من، ئەم قسەیە تەنها مەزەندەکاریە-لەدوای نوسینی ئەونامەیە، لنکۆڵن لەپەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی کردوە ولەدڵی خۆیدا گوتویەتی: (کەمێ ڕاوەستە، لەوانەیە پێویست نەبێ ئەوەندەش بەپەلەبم.شتێکی ئاسانە لەکۆشکی سپیدا دابنیشم وفەرمانی هێرش کردن بۆمیدی دەربکەم.بەڵام ئەگەر منیش لە(گیتسبۆرگ) بوایەم، ئەولێشاوی خوێنەم بدیبایە کەلەماوەی یەک هەفتەدا میدی بینی.ناڵەوهاواری بریندارەکان بەگوێمدا بچوایە.ڕەنگەمنیش هیچ دڵگەرمیەکم بۆهێرش کردن نەبوایە... ئەگەرلەهەمان باری دەرونی میدیدابومایە.منیش لەوانەیە هەروەکو ئەوم بکردایە.

بەهەرحاڵ، ئێستا لەژێرپردەکەدا ئاوهەیە.ئەگەر نامەکە بنێرم، لەوانەیە هەستەکانی خۆم ئاسودەبکەم، وەلێ میدی ناچاردەکەم هەوڵی پاساودانی هەڵوێستەکەی خۆی بدات، جگەلەوە وایشی لێدەکەم ڕەخنەم لێبگرێت، واتە هەستە دوژمنکارانەکانی دەبزوێنم وبەوەش پێگەی خۆی وەکوسەرکردەیەك تێ دەپەڕێنێت ولەوانەشە بەوکردەوەیە پاڵی پێوەبنێم بۆنەوەی دەست لەکارکێشانەوەی خۆی ڕابگەیەنێت).

بەوشێوەیە، وەکوپێشتر ئامـاژەم پێدا، لنکـۆڵن نامەکـەی لاوەنـا، چـونکەلەڕێگەی ئەزمونەکانیـەوە فێـری ئـەوە ببووکەڕەخنـە وسەرزەنشتەتوندەکان بەسەرەنجامی هیچ وپوچ وبێ کەڵك کۆتاییان دێت.

(تێودۆر ڕۆزڤلت) لـەماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا، ئەودەمانـەی گرفتی سەخت وئاڵۆزی بۆدەهاتە پێش، ڕادەکشا وچاوی دەبڕیەوێنەگەورەکەی سـەرۆك لنکـۆڵن کەبـەدیواری نوسـیگەکەیدا لـەنێو کۆشـکی سـپیدا هەڵواسرابوو، دەیگوت: (ئەگەر لنکۆڵن لەجێی من بوایە چی دەکرد؟ چۆن ئەم گرفتەی چارەسەردەکرد؟ ).

باجـارێکی تـر، هەرکەویـستمان سەرزەنـشتی کەسـێك بکـەین، وەرەقەیەکی پێنج دۆلاری بەدەستەوە بگرین وسەرنجی وێنەکەی لنکۆڵن بدەین ولـەخۆمان بپرسین: (ئەگـەر ئـەم مەسـەلەیە ڕووبـەڕووی لنکۆڵن بوایەتەوە، چۆن چارەسەری دەکرد؟ ).

ئایا تۆکەسێك دەناسیت بتەوێت چاکی بکەیت وگۆڕانکاری بەسەردا بنێیـت؟ چـاکە، ئەوەشـتێکی باشـە.مـن خۆزگـەدەخوازم کەسـێکی واهـەبێت.بـەڵام بۆچی لەخۆتـەوە دەسـت پێناکـەیت؟ لـەمن گەراییەکەی

نێوناخی خۆتەوە دەست پێ بکە.لەمەداچەندین شتی سودبەخشت دەست دەکەوێ پترلەوەی کەلەگۆڕینی کەسانی تردا دەستت دەکەوێت.
براوننگ دەڵێت: (ئەوردەمەی مرۆڤ دەست بەململانێ دەکات لەگەڵ ناخی خۆیدا، نرخ وبەهایەك پەیدادەكات، چاکسازی کردن لەناخی خۆیدا ماوەیەکی درێژدەخایەنێت.پاش ئەوە دەتوانیت کاتەکانی دەست بەتاڵیت تەرخانبکەیت بۆگۆڕینی کەسانی تر. بەڵام یەکەمجار لەخۆتەوە دەست پێبکە.

کۆنفۆ شیۆس دەڵێت: (لەکاتێکدا ماڵەکەی خۆت پڕبوە لەبەفر، لەو بەفرەپەست مەبە کەکلۆکلۆ لەبانی ماڵە دراوسێکەت دەکەوێتە خوارەوە).

ئەگەر بمانەوێت کەسێك بەجۆرێك نیگەران بکەین کەبەدرێژایی ژیانی لەیادیدا بمێنێتەوە، هیچمان لەسەرنیە ئەوەنەبێت پەنابەرینەبەر ڕەخنەگرتنێکی توندوتیژی لێی.بازۆرمتمانەشمان پتەوبێت بەوەی ڕەخنەکە ڕاست ودروستە.

پێویستە لەکاتی هەڵس کەوت کردنمان لەگەڵ خەڵکیدا، ئەوەمان لەبیربێت کەئێمە لەگەڵ خەڵکانێکی لۆژیکیدا هەڵس وکەوت ناکەین، بەڵکو لەتەك کەسانێکی عاتیفیدا ڕەفتاردەکەین کەبەناهەق هەڵدەچێت وبەهۆی غروریشەوە دەشڵەژێت!!.

ڕەخنەگرتن پزیسکەیەکی مەترسیدارە، پزیسکەیەکە لەوانەیە ببێتەهۆی تەقاندنەوەی غرور.ئەوتەقینەوەیەش زۆربەی کات دەبێتەهۆی خێراهاتنە پێشەوەی مەرگ.بۆنمونە: ڕەخنەی توندگیرا لە (ژەنراڵ لیۆنارد وود) ڕێگەیان نەدا لەگەڵ سوپادا بڕوات بۆفەرەنسا.ئەم گورزەش کەئاراستەی کرا، بویەهۆی کورت بونەوەی تەمەنی.

هەر ڕەخنەگرتنی توند، وای کرد نوسەری بەناوبانگی بەریتانی (تۆماس هاردی) بۆهەتاهەتایە واز لەنوسین بهێنێت... هەروەها (تۆماس چاترتۆن)ی هۆزانڤانی بەناوبانگی بەریتانیش، هەربەهۆی ڕەخنەی توندەوە پەنای بردەبەر خۆکوشتن.

(بنجامین فرانکلین) لەهەرەتی لاویدا، یەکێك بوو لەدیبلۆماتەهەرە ناودارەکان. تەنانەت کرایە بالۆیزی ئەمریکا لەفەرەنسا. ئایانهێنی سەرکەوتنی ئەوپیاوە لەچیدابوو؟ بەڕێز فرانکلین خۆی دەڵێت: (هەرگیز باسی خراپەکانی کەسانی ترناکەم، بەڵکوتەنها باسی ئەوباشیانە دەکەم کەدەزانم تیایاندایە) هەرکەسێکی دەبەنگیش بگرێت، دەتوانێ ڕەخنە بگرێت وئەوانی ترقەڵس بکات. زۆربەی گەمژەکانیش وادەکەن. وەلێ پێویستە مرۆڤ بەسەرناخی خۆیدا زاڵ بێت ولێبوردە وتێگەیشتووبێت. (کارلیل) دەڵێت: (پیاوی مەزن لەڕێگەی ڕەفتارکردنیەوە لەگەڵ گێلەپیاوەکاندا، گەورەیی خۆی دەردەخات).

لەبری ڕەخنەگرتن لەخەڵك، باهەوڵ دەین تێ بگەین. باهەوڵ دەین بیرکەینەوە لەوەی ئەوان بۆچی وەها ڕەفتاردەکەن؟ .ئەمەبەسود ترە لەڕەخنەگرتن. دەشبێتە هۆی خۆشەویستی وبەرگەگرتن وسۆزگۆڕکێ.

(بۆئەوەی بەهەموان ئاشنابیت. پێویستە لێبوردەبیت لەتەك هەمواندا).

دروست وەك دکتۆر جۆنسۆن دەڵێت: (خوای گەورە لێپرسینەوەلەهیچ مرۆڤێك ناکات، بەرلەوەی بواری پەژیوان بونەوەی بداتێ).

کەواتەبۆچی من وتۆ دادگایی بکەین؟ !

# بەشی نۆیەم

## نهێنی هەرەگەورەی هەڵس وکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا.

لەژێرئەم ئاسمانە بەرزوبەرینەدا، تاکەیەك ڕێگەهەیە بۆئەوەی کەسێك واڵێ بکەیت کارێك بکات.جائایا هیچ جارێك هەڵوێستەیەکت کردووە ولەخۆتت پرسیوە ئەوڕێگەیە کامەیە؟ بەڵێ، تەنها یەك ڕێگەهەیە، ئەویش ڕاکێشانی کەسێکەبۆئەوەی ئارەزوی بچێتەسەرکردنی ئەوکارەی کەتۆدەتەوێت بیکات.

لەبیرت بێت، جگە لەوڕێگەیە، ڕێگەی ترنیە.بێگومان تۆدەتوانیت کەسێك واڵێ بکەیت کاتژمێرەکەی خۆییت پێ بدات، ئەگەر لولەی دەمانچەکەت بکەیتە سەرسنگی.یان هاوکارەکەت واڵێ بکەیت یارمەتیت بدات ئەگەر هەڕەشەی کوشتنی لێ بکەیت.ئەگەر هەڕەشەی شەللاقیش لەهەرمنداڵێك بکەیت دەتوانیت ئەوەی دەتەوێت پێی بکەیت.وەڵێ ئاگاداربە ئەم شێوازەدڕندانەیە، بەرەنجامی مەترسیدار ونەخوازراوی دەبێت. تاکەڕێگەش لەبەردەممدا، بۆئەوەی بتوانم کارێکت پێ بکەم کەمن دەمەوێت بیکەیت، ئەوەیەکە تۆئارەزوت لەچیەپێت ببەخشم.وەڵێ

ئایاتۆچیت دەوێت؟ (دکتۆر سیگمۆند فرۆید) کە یەکێکە لەبەناوبانگترین پزیشکە دەروونناسەکانی سەدەی بیستەم، لەوەڵامی ئەوپرسیارەدا، پێی وایەهەمووئەوکارانەی مرۆڤ دەیانکات لەدووپاڵنەری سەرەکیەوە هەڵدەقوڵێن: پاڵنەری سێکس وئارەزوی ئەوەش کەببنە کەسانێکی مەزن.

پرۆفیسۆر(ژۆن دیوی)ش کەیەکێکە لەناودارترین فەیلەسوفەکان لەئەمریکادا، بەشێوازێکیتردەربڕی لەوڕاستیەکردووە.دکتۆر (دیوی)دەڵێت: قوڵترین هاندەرلەسروشتی مرۆڤایەتیدا بریتەیەلە(ئارەزوکردنی مرۆڤ لەوەی کەسێکی گرنگ وبەبایەخ بێت).ئەم ڕستەیەت لەبیربێت (ئارەزوکردنی مرۆڤ لەوەی کەسێکی گرنگ وبەبایەخ بێت).ئەم ئارەزوە زۆرگرنگە و، لەنێو ئەم پەڕاوەشدا لەبارەی ماناکانی ئەم ڕستەیەوە زۆر دەخوێنیتەوە وزۆر دەبیستیت.

کەواتە تۆچیت دەوێت؟ شتێکی ئەوتۆت ناوێ.بەڵکوچەندشتێکی کەمت دەوێت، بەلام ئەوشتەکەمە، کەس ناتوانێ نکوڵی لێ بکات.هەرمرۆڤێکی سروشتی بگریت حەزی لەمشتانەی خوارەوەیە:

١)تەندروستی وپارێزگاری کردن لەژیان.

٢) خۆراك.

٣)خەوتن.

٤) ماڵ وسامان وئەوپێداویستیانەی بەپارەوسامان دەکڕدرێن.

٥)ژیان لەپاشەڕۆژدا.

٦)ڕەزامەندی وتێربوونی سێکسی.

٧) پەروەردەکردنی باشی منداڵەکانی.

٨) هەستکردن بەگرنگی وبایەخی خۆ.

زۆربەی ئەم پێداویستیانە یان ئەم ئارەزوانە (جگەلەیەکێکیان)دەکرێ دەستەبەر بکرێن.وەلێ ئارەزویەکی گرنگ وقوڵیشی هەیە کەوەك خەو وخۆراك بایەخدارە، بەلام بەدەگمەن فەراهەم دەکرێ.ئەویش ئەوئارەزوەیەکەفرۆید ناوی دەنێت (ئارەزوکردنی ئەوەی کەسێکی مەزن بێت) ئەمەش هەمان ئەوئارەزوەیەکە دیوی ناوی دەنێت (ئارەزوکردن لەوەی گرنگ وبایەخداربێت).

جارێکیان لنکۆڵن نامەیەك دەنوسێت وسەرەتای نامەکەی بەم دێرەدەست پێدەکات کەدەڵێت: (هەموو مرۆڤێك حەزی لە موجامەلە هەیە)... ولیەم جیمس دەڵێت: (قوڵترین بنەما لەسروشتی مرۆڤدا بریتیە لەبەدەست خستنی ستایش). ئەم باس لە(ئارەزو) یان (هیوا)یان (حەز وتامەزرۆیی) بۆستایشکردن ناکات.بەڵکو باس لەبەدەست هێنانی ستایش دەکات .

لێرەدا برسێتیە شەکەتکارەکەی نێو سروشتی مرۆڤ خۆی مەڵاس داوە، ئەوکەسە دەگمەنەی کەدەتوانێت برسێتیەکەی دڵی تێربکات. تەنانەت کابرای دوکانداریش نیگەران دەبێت بەمردنی.

ئارەزوی هەستکردن بەگرنگی، یەکێکە لەوخەسڵەتانەی کەمرۆڤ لەئاژەڵ جیادەکاتەوە.بۆنمونە : من کاتێ جوتیاربووم لەمیسوری، باوکم بەرازی بچکۆلەوئاژەڵی سپی بەخێودەکرد. باوکم ڕاهاتبوو لەسەرئەوەی ئاژەڵەکانی لەبازارەکانی شاروپیشانگاکانی ئاژەڵاندا نمایش بکات کەلەڕۆژئاوای ناوەڕاستداسازدەکران.زۆربەی جارنیمەخەڵاتی یەکەممان بەدەست دەهێنا.باوکم هەموو ئەوشریتەشینانەی کەبەخەڵات

وەریدەگرتن دەیلکاند بەپارچە مۆزلینێکی سپییەوە.هەرکاتێ میوانمان بهاتایە، پارچەمۆزلینەسپیەکەی دەهێناپیشانی میوانەکانی دەدا، من سەرێکی مۆزلینەکەم دەگرت وباوکیشم سەرەکەی تری دەگرت وشریتەشینەکانمان پیشانی میوانەکان ئەدا.

بەرازەکان هیچ بایەخێکیان بەوشریتەشینانە نەدەداکەبەخەڵات وەریانگرتبوو!.بەڵام باوکم بایەخی پێ ئەدا.ئەوخەڵاتانە وایان لێدەکرد هەست بەگرنگی خۆی بکات.

ئەگەر پێشینانمان بەوشێوەیە حەزیان لەهەستکردن بەبایەخی خۆیان نەکردایە، سەرهەڵدانی شارستانیەت ئەستەم دەبوو، تەنانەت بەبێ ئەوئارەزووەش بەتەواوی دەچووینەقاڵبی ئاژەڵانەوە.

هەرئەم ئارەزوەبوو کەپاڵی نابەونوسەرەهەژار ونەخوێندەوارەکەدەست بکات بەخوێندنەوەی ئەوکتێبەیاساییەدڕاوانەی کەلەبەرمیلی خۆڵ وخاشاکدا دەیدۆزینەوە.لەوانەیە ناوی ئەونوسەرەشت بیستبێت.ناوی لنکۆڵن بوو.هەمان ئەو ئارەزووەش پاڵی بە(دیکینز)ەوە نا، تاکو ڕۆمانە ئەمروبەناوبانگەکانی بنوسێت، یان (کریستۆفەر ڕین)ی هاندا سەمفۆنیا قەشەنگەکانی دابنێت، یان ڕۆکفیلەریشی هاندا بۆئەوەی ملیۆنەها دۆلار کۆبکاتەوە!.

هەمان ئەم ئارەزوەیە وادەکات دەوڵەمەندترین پیاوی شارەکەی تۆهەوڵ بدا بۆئەوەی خانویەك بکاتەوە کەزۆر لەپێویستی خۆی زیاتربێت.

هەمان ئارەزوە تۆش هان ئەدا نوێترین قۆندەرە لەپێ بکەیت وتازەترین ترۆمبیل لێ بخوڕیت وکاتێ باسی منداڵەکانیشت ئەکەیت، باسی منداڵەزیرەکەکانت بکەیت!!.

هەمان ئارەزوو منداڵ وهەرزەکارەکان هاندەدات ببنەتاوانبار وئەندامی باندەکان... (أ.ب مالرۆنی) کەکۆنەئەفسەرێکی پۆلیسی نیویۆرکە دەڵێت: هەرزەکارە ئاساییەکان، گیانی من گەراییان تێدایە..یەکەم داواکارییان ئەوەیە وێنەیان لەرۆژنامەکاندا بلاوبکرێتەوە وەك: بابی رۆس ولاگۆردیا وئەنیشتاین ولیندبرگ وتۆسکانی ، یان وەکو رۆزڤلت!!.

ئەگەرتۆ پێم بڵێیت چۆن هەست بەبایەخی خۆت دەکەیت.ئەواپێت ئەڵێم تۆچۆن کەسێکیت.ئەم هەست کردنە کەسایەتی تۆدیاری دەکات.گرنگترین شتیشەکەپەیوەندی بەتۆوە هەبێت.بۆنمونە: رۆکفیلەر بەوشێوەیە هەستی بەگرنگی خۆت دەکرد کە ماڵ وسامان ببەخشێت بۆکردنەوەی نەخۆشخانەیەکی تازەلەوڵاتی چین.بۆچارەسەرکردنی ئەوهەزارانەی کەنەبینیبونی و نەدواتریش دەی بینین.دیلینگر لەلایەکی ترەوە.بەشێوەیەك هەستی بەگرنگی خۆی دەکرد کەببێتە سەرۆکی باندێکی دزین وتالانکردنی بانکەکان.

ئەودەمەی پیاوانی پۆلیس سەرقاڵی شوێنپێ هەڵگرتنی بوون، لەکێڵگەیەکی ناوچەی (مینسوتا)دا، خۆی حەشاردا و گوتی: (من دیلینگرم).زۆرشانازی دەکرد بەوەوە دوژمنی یەکەمی گەلە.ئینجاگوتی: (هیچ ئازارتان نادەم، بەلام من دیلینگرم).

بەڵێ، جیاوازی هەرە گرنگی نێوان رۆکفیلەر ودیلینگر، بریتیە لەشێوەی هەستکردنیان بەبایەخی خۆیان.ئەمیان لەرێی بەخشینی ماڵ

وسامانەوە هەست بەبایەخی خۆی دەکات، ئەویان لەڕێی دزین

وشکاندنی بانکەکانەوە.

مێژوپڕە لەنمونەی سەرنج ڕاکێش، سەبارەت بەهەندێ کەسایەتی ناودارکەهەوڵ وتەقالایان داوە لەپێناوی هەستکردنیان بەبایەخی خۆیاندا.تەنانەت جۆرج واشنتۆن پێی خۆش بووبەناوی (خاوەن شکۆسەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکان) بانگ بکرێ.کۆڵۆمبسیش نازناوی(ئەمیراڵی دەریا)ی پێ خۆش بوو.کاترینی مەزنیش هەرگیز ئەونامانەی نەدەکردەوە کەلەسەریان نەنوسرایە (شاژنی خاوەن شکۆ)... .هاوسەرەکەی لنکۆڵنیش کاتێ لەکۆشکی سپیدابوو، وەك پڵنگ هاشاوڵی بردبۆ (گرانت) خان وبەسەریداقیڕاندنی(جۆن دەوێرنت لەبەرانبەرم دابنیشیت، بەرلەوەی خۆم بانگهێشتت بکەم؟ )... .

هەندێ کەس لەنەخۆشین چاك دەبنەوە لەپێناوی ئەوەدا بایەخ وسۆزی خەڵك بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، تاکولەوڕێگەیەوە هەست بەبایەخی خۆیان بکەن.باخاتوو(ماکینلی) بەنمونە وەربگرین. ئەم ژنە بەوشێوەیە هەستی بەبایەخی خۆی کرد کەمێردەکەی هەموو کار وبارەکانی دەوڵەت فەرامۆش بکات ولەلای بمێنێتەوەتاکو خەوی لێ دەکەوێت.یاخود جارێکیان حەزی تینوی بۆهەستکردن بەگرنگی خۆی بەوە تێرکرد کەمێردەکەی لەلای بمێنێتەوە تاکوپزیشك چارەسەری ددانی دەکات.لەکاتێکدا مێردەکەی سەرۆکی ئەمریکابوو، وادەیەکی گرنگیشی هەبوولەگەڵ (جۆن های)دا!!.

خاتوو (ماری ڕۆبرتس) بەسەرهاتنی خانمێکی بۆگێڕامەوە کەتەنها بۆئەوەی هەست بەگرنگی خۆی بکات، کەمئەندام ببوو، پەکی

کەوتبوو. خاتوو ڕینهارت دەڵێت: (ڕۆژێکیان، دەبوئەوژنە ڕووبەڕووی مەسەلەیەك بێتەوە، لەوانەیە مەسەلەی بەساڵاچون وشونەکردنی بێت. ساڵەکان بەسەریدا تێ دەپەڕین وئەم هەریەتەنهایی مابویەوە. بۆیە بەتەواوی داڕوخا. بەهۆی بیرکردنەوە لەم حاڵە، نەخۆش کەوت وبۆماوەی دە ڕۆژ لەجێگەدا کەوت. دایکی خواردنی بۆدەهێنا وخزمەتی دەکرد. ڕۆژێکیان دایکیشی مرد! کەچی لەدوای چەندهەفتەیەك، ئەوخانمەی کەپێشتر پەکی کەوتبوو، چاك بویەوە ولەجێگەکەی قوت بویەوە وجلەکانی لەبەرکرد وگەڕایەوە بۆنێو ژیانی پێشوی... دیارە ئەم ژنە لەپێناوی سەرنج ڕاکێشانی دایکی بەلای خۆیدا، کەمئەندام ببوو.

هەندێ لەسەرچاوەکان باس لەوەدەکەن کەهەندێ کەس بەڕاستی شێت دەبن بۆئەوەی لەدونیای خەونەکانی شێتیدا هەست بەگرنگی خۆیان بکەن، ئەو گرنگیەی کەلە دونیای سەختی واقیعدا هەستی پێ ناکەن. لەنەخۆشخانەکانی ئەمریکاشدا، ئەونەخۆشانەی هەست بەئازارە دەرونیەکان دەکەن، ژمارەیان زۆرزیاترە لەجۆرە نەخۆشیەکانی‌تر. ئەگەر تۆلەتەمەنی پەنجاساڵیدا ولەویلایەتی نیویۆرك نیشتەجێیت، ئەوا هەلی چونەژورەوەت بۆشێتخانە لەتەمەنی حەفتاساڵیدالەنێوان یەك بۆبیست دایە.

***ئەی هۆکاری ئەم شێتبونە چیە؟***

هیچ کەسێك لەتوانایدانیە وەڵامی پڕا وپڕی ئەم پرسیارە بداتەوە، بەڵام ئێمە دەزانین هەندێ نەخۆشینی وەك(سفلس وداڕوخانی دەمارەکان) دەبنەهۆی تێك چونی شانەدەماریەکان وشێت

بوون.لەڕاستیدا، نیوەی نەخۆشینەدەماریەکان دەگەڕێنەوە بۆ هۆکاری ئەندامی، وەك ئەوەی مێشك توشی شێتی بوبێت، هەروەها کحول وبریت.وەڵ نیوەکەی تری(کەجێگەی گرنگی پێدانی ئەم بگرە وبەردەیە) نیوەی ڕاستی ئەوخەڵکانەی شێت دەبن هیچ کێشەیەکیان لەشانە دەماریەکاندانیە.چونکەکاتێ پشکنینی وردی تاقیگەییان بۆئەنجام دەدرێ.دەردەکەوێ هیچ کێشەیەك لەخانەکانی مێشکیاندا نیە، مێشکیان ڕێکوپێکە وەکومێشکی من وتۆ.

*دەی کەواتە بۆچی ئەوجۆرە کەسانە شێت دەبن؟*

بەم دواییانە ئەم پرسیارەم ئاراستەی سەرۆکی پزیشکەکانی یەکێك لەگرنگترین نەخۆشخانەی شێتەکان کرد.ئەم نۆژدارەکەبەهۆی لێهاتویی خۆیی وشارەزایی لەنەخۆشیەدەماریەکاندا بڵندترین پۆستی پێ درابوو.بەڕاشکاوی پێی ڕاگەیاندم کەوەڵامی ئەم پرسیارە نازانێت وتێ ناگات بۆچی خەڵکی شێت دەبن... ئەوەیشی بۆ دووپات کرمەوە کەهیچ کەس وەڵامی تێر وتەواوی ئەوپرسیارەی لانیە.لەگەڵ ئەوەشداگوتی: (زۆربەی ئەوانەی شێت دەبن، لەوشێت بونەیاندا هەست بەگرنگی خۆیان دەکەن.ئەوهەستەی کەلەجیهانی واقیعدا نەیانتوانیوە پێی بگەن.دواترئەم بەسەرهاتەی بۆگێرامەوە: (ئافرەتێکی نەخۆشم لایە، ئەم ئافرەتە لەشوکردنیدا بەختەوەر نەبووە.ئەم حەزی لەخۆشەویستی وتێربونی سێکسی ومنداڵ وپێگەی کۆمەڵایەتی بووە، بەڵام ژیان ئەم هیوایانەی ئەوی تاساند.مێردەکەی خۆشی نەدەویست، تەنانەت ئامادەنەبور نانی لەگەڵدا بخوات.ناچاری دەکردنانی بۆبێنێتە ژورە

تەنهاییەکەی خۆیەوە.نەمنداڵی بوو، نەهیچ پێگەیەکی کۆمەڵایەتیشی دەستکەوت.بۆیە لەئەنجامداشێت بوو.لەخەیاڵیدا لەمێردەکەی جیابوەتەوە وشۆرەت وناوی پێشوی خۆی بۆگەڕاوەتەوە.ئێستا پێی وایە شوی بەپیاوێکی ئۆرستۆکراتی ئینگلیزی کردوە.بۆیە هەمیشەپێداگری دەکات کە بە(سمیس خان) بانگ بکرێت.

سەبارەت بەمنداڵیش، لەخەیاڵیدا هەمووشەوێك منداڵێکی دەبێت.هەرکاتێ دێم بۆسەردانی پێم دەڵێت: دکتۆرگیان، دوێنێ شەومنداڵێکم بوو.ژیان.هەموو خەونەکانی ئەم ژنەی لەسەرگابەردی واقیع وردوخاش کرد، وەلێ لەدورگە دڵڕفێنەکانی شێتیدا، خەونەکانی دێنێتەدی (دەربڕینی وەرگێڕ).

ئایا ئەمەشێکی تراژیدیە؟ نازانم.پزیشکەکەی پێمی گوت: (ئەگەربتوانم دەست ببەم وهۆشی بهێنمەوەجێی خۆی وچاکی بکەمەوە.هەرگیز چاکی ناکەمەوە.چونکە ئەوئافرەتە بەوشێتیەوە بەختەوەرترە).

هەندێ لەشێتەکان لەمن وتۆبەختەوەرترن.زۆرێك هەن لەشێت بونیان چێژ وەردەگرن.بۆچی نا؟ ئاخەر توانیویانە گرفتەکانیان چارەسەربکەن.دەتوانن هەرلەجێی خۆیانەوە چەکێکت بەنرخی یەك ملیۆن دۆلاربۆنیمزابکەن!!یان کارتێکت پێ بدەن، بۆچارپێکەوتنی(ئاغاخان).لەمیانی جیهانی خەونەکانیانەوە هەست بەوگرنگیە دەکەن، کەلەقولاییەکانی ناخیاندا حەزیان پێ کردووە. ئەگەر کەسانێك هەبن تاسنوری شێت بوون تینوی هەستکردن بەگرنگی خۆیان

بن.کەواتە بیربکەرەوە لەو مۆجیزانەی کەدەتوانین لەرێی ستایش کردنی راستگۆیانەی بەرانبەرەکانمانەوە بەدەستی بێنین.

دووکەس لەمێژوداهەن، کەهەریەکێکیان سالأنە یەک ملیۆن دۆلار دەستکەوتیان بوو، یەکەمیان(والتەرکرایزلەر)ەو، دووەمیان (چارلزشواب)ە.

بۆچی (ئەندریۆکارنگی) سالأنەیەک ملیۆن دۆلاری دەدایە شواب، واتە بۆهەر رۆژێك زیاترلەسێ هەزار دۆلار؟.

ئایا(ئەندریۆکارنگی) سالأنە یەک ملیۆن دۆلاری ئەدایە شواب، چونکە شواب زۆر بیلمەت بوو؟ نەخێر.ئەی لەبەرئەوەی پێی ئەدا کەشواب لەهەرکەسێکی ترزیاترشارەزای پیشەسازی پۆلأبوو.نەخێر.چارلزشواب، خۆی باسی ئەوەی بۆکردم کەچەندین کرێکاری هەیە هەموو کارەکانی بۆدەکەن ولەخۆیشی شارەزاترن. شواب دانی بەوەدا ناکەئەم مووچەیە لەپای تواناکانیدالەمامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا وەردەگرێ.پرسیارم لێکرد، چۆن ئەم توانایە وەگەڕدەخات.فەرموو لەگەڵ نهێنیەکەیدا(لەدەمی خۆیەوە) کەبەچەند وشەیەک دەری بڕین.هەقە وشەکانی لەسەر برۆنزهەڵبکەنرێن وبەهەموو ماڵ وقوتابخانەیەکدا هەڵبواسرێن... پێویستە مندالأن فێری ئەو وشانەبکرێن، لەبری ئەوەی سەرقاڵ بکرێن بەفێربونی لاتینیەوە یان زانینی بڕی ئەوبارانەوە کەسالأنە لەبەڕازیل دەبارێت!!.ئەگەر ئەم وشانە بکەینە کردەوە، ژیانی منیش وتۆش دەگۆڕن.

شواب گوتی: (پێم وایە ئەوتوانایەی کەهەمە بۆدروستکردنی دڵگەرمی لەنێو خەڵکیدا، مەزنترین خەزنەیە کەمن هەمە ، ستایش کردن وهاندانیش تاکە ڕێگەیەکە بۆگەشەدان بەناخی مرۆڤ.

هیچ شتێك نیە بەئەندازەی ڕەخنەی ئەوانەی لەئاستی بالاتردان، ئارەزوەکانی ناخی مرۆڤ بکوژێت.بڕوام بەوەهەیە مرۆڤ هانبدرێ بۆکارکردن.لەبەر ئەوەئارەزوم لەستایش کردنە، نەك لەدوو ڕوویی..هەرشتێك دڵم گرتی، لەناخی دڵمەوە دەست گوشادانە ستایشی دەکەم).

شواب ئاوای دەکرد.ئەی مرۆڤی ئاسایی چی دەکات؟ تەواوپێچەوانە دەکات.ئەگەر شتێکی بەدڵ نەبێت تورەدەبێت وهەڵدەچێت.ئەگەر شتێکیشی بەدڵ بێت، بێدەنگ دەبێت.

پاشتر شواب ئاشكرای كرد: (لەماوەی ژیانمدا، چاوم بەزۆرێك لەکەسایەتیە بایەخدارەکان لەهەموولایەکی جیهانەوە کەوتووە... تائێستا کەسایەتیەکم نەدیوە کەلەڕێی بەکارهێنانی گیانی ڕەخنەگرتنەوە توانیبێتی کاری باشتربکات، وەك لە بەکارهێنانی گیانی پێکەوە گونجان).

پاشان بەڕاشکاوی گوتی: (یەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەندریۆ کارنگی، بریتی بوولەوەی کەئەو بەئاشکرا ونهێنی ستایشی یاریدە دەرەکانی خۆیی دەکرد.تەنانەت لەسەرکێلی گۆڕەکەیشی ڕستەیەکی نوسیبوو کەستایشی یاریدەدەرەکانی لێ دەچۆڕا... نوسیبووی: (ئەم گۆڕە، ئارامگەوی کەسێکە، توانیبوی ئەوکەسانە لەخۆی نزیك بکاتەوە کەلەخۆی زیرەك تربوون)!!.

ستایش کردنی دڵسۆزانە، یەکێك بوو لەنهێنییەکانی سەرکەوتنی ڕۆکفیلەر لەهەڵس وکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا.بۆنمونە، جارێکیان یەکێك لەهاوکارەکانی بەناوی (ئیدواردبیدفۆرد) بەهۆی مۆرکردنی گرێ بەستێکی خراپەوە لەباشوری ئەمریکا.یەك ملیۆن دۆلار زیانی کرد... لەم کاتەدا ڕۆکفیلەر دەیتوانی ڕەخنەبگرێت.بەڵام دەیزانی(ئیدوارد) ئەوەی لەتواناییدا بووە، بەگەڕی خستوە، کەچی گەشتۆتە ئەو وئەنجامە وکۆتایی بەکێشەکە هێنا.لێرەدا ڕۆکفیلەر بیانوییەکی دۆزییەوە بۆ ئەوەی ستایشی بکات.لەبەرئەوە پیرۆزبایی لێکرد کەتوانیویەتی ٦٠٪ی ئەوپارەیە لەفەوتان ڕزگاربکات کەبۆئەو مامەڵەیە تەرخان کرابوو.بۆیە بەدەم ستایش کردنیەوەگوتی: (شتێکی باشە... ئێمەهەمیشە واناکەین).

جارێکیان پەنام بردە بەر ڕۆژوگرتن.ماوەی شەش ڕۆژو شەش شەو بەبێ نانخواردن مامەوە.ئەمەشتێکی سەخت نەبوو.بەڵکو لەڕۆژی شەشەمدا کەمتر لەڕۆژی دووەم هەستم بەبرسێتی دەکرد.لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم، تۆش دەزانیت، خەڵکی بڕوایان وایە گوناهێکی گەورەدەکەن ئەگەرخێزان وهاوکارەکانیان بەبێ نان بۆماوەی شەش ڕۆژ بهێڵنەوە.کەچی جاری واهەیە شەش ساڵ وزیاتریش وازیان لێ دەهێنن بەبێ ئەوەی ستایشێکی دڵسۆزانە بدەن بەگوێیاندا (لەکاتێکدا ستایشکردنی دڵسۆزانە خۆراکی گیانە-وەرگێڕ).

کاتێکیش(ئەلفردلانت)ڕۆڵی سەرەکی گێڕاله(یەکخستنەوەی ڤیەننا)دا، گوتی: (پێویستم بەهیچ نیەجگە لەتێرکردنی عیزەتی نەفسم)!.

ئێمەخۆراکی لەش دەدەین بەمنداڵەکانمان وهاوڕێکانمان، بەڵام زۆربەدەگمەن عیزەتی نەفسان تێردەکەین.گۆشت وپەتاتەیان پێ ئەدەین

بۆئەوەی وزەیان تێدادروست بێت.کەچی خۆمان بەدووردەگرین لەوەی وشەی نەرم وناسك وستایش کردن بدەین بەگوێیاندا... هەرچەندە ئەو وشانە بۆماوەی چەندین ساڵ وەکوجریوەی ئەستێرەکانی بەرەبەیان لەمێشکیاندا دەمێننەوە.

هەندێ لەخوێنەران لەکاتێکدا ئەم دێڕانە دەخوێننەوە، دەڵێن: (ئەمە قسەیەکی پوچە وماستاوکردنە!ئەم شێوازەم تاقی کردۆتەوە وهیچ سودێکی نیە-لەگەڵ زیرەکەکاندا سودی نیە)!.

بێگومان، زۆر بەدەگمەن ماستاوکردن وڕوپامایی لەگەڵ کەسانێکی زیرەك وچاوکراوەدا سودی دەبێت.چونکە شتێکی هیچ وپوچ وبێ مانا ودرۆزنانەیە... بۆیە هەردەبێ شکست بێنێت... ڕاستەخەڵکانێکی زۆر تینوی ستایش کردنن، تەنانەت هەمووشتێ قووت ئەدەن وەك چۆن پیاوێکی برسی هەڵپەدەکات وگیا وکرمەکانیش پێکەوە دەخوات!.

بەڵام بۆچی، بۆنمونە، برایانی مەدیفانی، کەهەریەکەیان پترلە ژنێکیان هەبوو لەبواری فرەژنیدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا؟ بۆچی ئەوانەی نازناوی (شازادەکان)یان هەڵگرتبوو، توانیان لەگەڵ دووان لەبەناوبانگترین ئەستێرە جیهانیەکانی شاشە(بریمادۆنا) و(بریارە هاتون).هاوسەرگیری بکەن کەئەودوانە ملیۆنەها دۆلاریشیان هەبوو؟

بۆچی؟ چۆن توانییان وابکەن؟ .

(روجرزسانت) لەوتارێکیدا کەلەڕۆژنامەی(نازادی)دابڵاوی کردەوە دەڵێت: (ڕامێنانی ژنان لەلایەن مەدیفانیەوە، بەیەکێك لەشتەتەمومژدارەکانی ڕۆژگار لەقەڵەم ئەدرێ).

هونەرمەندی مەزنی جیهانی(پۆلانیفاری) ئەومەسەلەیە شیدەکاتەوە ودەڵێت: (ئەوان لەهەموو ئەوپیاوانەی من ناسیومن زیاتر لەهونەری پیاهەڵدانی ژن زیاتر تێدەگەن. هونەری پیاهەڵدانیش لەم چەرخەدا دەگمەنە.دووپاتی دەکەمەوە ئەمە نهێنی ڕاهێنانی ژنانە لەلایەن مدیفانیەوە).

تەنانەت شاژنە ڤیکتۆریاش لەباربوو بۆپیاهەڵدان.(دیزرائیلی)دان بەوەدا ئەنێت کەلەهەڵس وکەوت کردنیدا لەگەڵ شاژندا زیادەڕەوی دەکردلەپیاهەڵدانیدا.وەڵێ (دیزرائیلی)هەموو سیاسەتەکانی دیکەی نیوئیمپراتۆریەتی بەریتانی زیرەکترولێزانتربوو. بەڵکوبلیمەت بوو.ئەوشتەش کەسودی بەوگەیاندوە، لەوانەیە سود بەمن وتۆ نەگەیەنێت.چونکە لە ماوەی درێژخایەندا، پیاهەڵدانێ زیادەڕەوی تێداکرابێ بەزیان دەشکێتەوە، ئەویش وەکوپارەی ساختە، ئەگەر بتەوێ خەرجی بکەیت، کێشەت بۆدروست دەکات.

ئەدی جیاوازی چیە لەنێوان ستایش و ڕوپامایی دا؟ جیاوازیەکە زۆرسادەیە، یەکەمیان ڕاستگۆیانە ودووەمیان درۆزنانەیە. یەکەمیان لەدڵەوەدێتەدەرێ ودووەمیان لەدەمەوە دێتەدەرێ.یەکەمیان خودپەسەندانە نیە، بەڵام دووەمیان خود پەسەندانەیە.یەکەمیان لەئاستی جیهانیدا ڕێزی لێدەگیرێت.دووەمیان کەس ئارەزوی لێ نیە.

جارێکیان پەیکەرێکی نیوەیی ژەنرالْ (ئۆبردیگۆن)م لەکۆشکی (چابۆلتیک)ی شاری(مەکسیکۆ)بینی.لەدامێنی پەیکەرەکەدا ئەم چەندوشەدانایانە، کەلەفەلسەفەکەی ئۆبریگۆن وەرگیرابوون،

نوسرابونەوە: (لەودوژمنانە مەترسە کەپەلامارت ئەدەن، سڵ لەوهاوڕێ ودۆستانە بکەرەوە کەڕوپامایت بۆدەکەن).

نەخێراهەرگیز پێشنیاری ڕوپامایی ناکەم، مەسەلەکە لەوەتێ دەپەڕێ.من باس لەشێوازێکی تردەکەم لەژیاندا.لێم گەڕێ بادووبارەی بکەمەوە: باس لەشێوازێك تر، ڕێگەیەکی تردەکەم لەژیاندا.

پادشا(جۆرجی پێنجەم)کۆمەڵێ پەندی لەلایە کەلەسەردیواری نوسینگەکەی لەکۆشکی (بوکینگهام)داهەڵکۆڵراون.یەکێك لەو پەندانە دەڵێت: (فێرم بکەپیاهەڵدانی بێ نرخ قبوڵ نەکەم ونەیڵێم) ڕوپاماییش هیچ نیەجگە لەپیاهەڵدانێکی بێ نرخ.جارێك پێناسەیەکی ڕوپامایم خوێندەوە، هەقە ئەوپێناسەیە هەمیشە دووبارەبکرێتەوە، پێناسەکە دەڵێت: (ڕوپامایی بریتیەلەوەی هەواڵی ئەوەبدەیتە کەسی بەرانبەر کەخۆی پێی خۆشە، یان خۆی بڕوای وایە ئەوشتانەی تێدایە)واتە ڕوپامایی ئەوەیە بەگوێرەی بڕوای بەرانبەرەکەت بەخۆی، پیایدا هەڵبدەیت(وەرگێڕ).

هەرکاتێ شتێکی دیاریکراو نەبێ بیری لێ بکەیتەوە، ئەوا(٩٥٪)ی کاتەکانمان بەبیرکرنەوە لەخۆمان بەسەردەبەین.ئێستاش، ئەگەر بۆماوەیەك دەست هەڵگرین لەبیرکردنەوە لەخۆمان وبیرلەچاکەکانی کەسانی بەرانبەرمان بکەینەوە، هەرگیز پێویستمان بەوەنابێت پەنابەرینەبەر ڕوپامایی وستایشکردنی درۆزنانە.(ئەمرسونا)دەڵێت: (چاوم بەهەرکەسێك بکەوێت، پێم وایە لەڕوویەکەوە لەمن باشترە.لێرەوە ئیدی دەتوانم لێیەوە فێرببم).

ئەگەر ئەم شتەبۆ(ئەمرسۆنا) ڕاست بێت، ئەیناگونجێت بۆمن وتۆیش ڕاست بێت؟ باکەمێك دەست کۆتاکەین لەچاکە وپێداویستیەکانی خۆمان وهەوڵ بدەین تایبەتمەندی وچاکەکانی بەرانبەرەکانمان بدۆزینەوە.دواتر ڕوپامایی لەبیربکەین... ستایشی ڕاستگۆیانە ودڵسۆزانە بەکاربێنە.دڵسۆزبە لەستایش کردندا ودەست گوشادبەلەپیاهەڵدانیدا.ئەگەر وابویت خەڵکی ڕێزی قسەکانت دەگرن وبەپیرۆزیان دادەنێن، بەدرێژایی ژیانیان لەگوێیاندا نەمردەبێت ودەزرنگێتەوە.تەنانەت لەدوای ئەوەش خۆت قسەکانت لەبیر دەچێ.خەڵکی گوتەکانت دەڵێنەوە.

# بەشی دەیەم

## هەرکەس بتوانێ وابکات، هەموو جیهان هی ئەوە.
## هەرکەسیش نەتوانێت بەتەنهایی ڕێگە کە دەبڕێ.

هەموو هاوینێك بۆ ڕاوەماسی دەچم بۆ ماین.من بۆخۆم زۆر حەزم لە فرێز وکرێمایە.سەرسامم بەوەی ماسیەکان حەزیان لەخواردنی کرمە.بەڵام، کاتێ دەچم بۆ ڕاوەماسی، بیرلەوەناکەمەوە کەخۆم حەزم لەچیە.بەڵکو بیرلەوە دەکەمەوە کەماسیەکان حەزیان لەچیە.بۆیە نایەم تامی فرێزوکرێمابکەم بە قولاپەکەوە.نا، دێم کرمێك دەخەمە بەردەمی ماسیەکە و پێی دەڵێم: (حەزناکەیت ئەمەت دەست بکەوێت؟ ).

کەواتە بۆچی لەڕاوکردنی مرۆڤەکانیشدا ئەم لۆژیکە وەکارنەبەین؟ لوێدجۆرج وای دەکرد.کاتێ پیاوێ لێی پرسی‌ت کەئایا لەپاش ئەو هەموو سەرکردە سەربازیانەی وەك(وێلسۆن وئورلندۆ، کلیمنصو)کەڕۆشتن ولەبیرچونەوە، چۆن چۆنی مانەوەی خۆی لەدەستەلاتدا مسۆگەردەکات؟ ... لەوەلامداگوتی: ئەگەرفەزڵی مانەوەی بۆشتێك بگەڕێتەوە، لەوانەیە بۆئەو ڕاستیەبگەڕێتەوە کەفێری

بووە.ڕاستیەکەش ئەوەیە (ئەوتامە بەکاربێنیت کەلەگەڵ نێچیرەکەت دەگونجێت).

کەواتە بۆچی باس لەوە دەکەین کەخۆمان دەمانەوێت؟ ئەمەشتێکی منداڵانە وهیچ وپوچە.ئاساییەگەر بایەخ بەوە بدەیت کەخۆت ئەتەوێ.چونکە هەتا هەتایە هەروادەبێت وهەرگرنگی بەوە ئەدەیت کەخۆت دەتەوێ... هەموومان وەك تۆواین: ئێمە گرنگی بەوە ئەدەین کەخۆمان حەزمان لێیەتی.

بەم پێیە، تاکەڕێگە بۆئەوەی کاریگەری لەسەر بەرانبەرەکەت دابنێیت، بریتیەلەوەی باسی ئەوشتەی بۆبکەیت کەئەوخوازیاریەتی و، بۆی ڕوون بکەیتەوە کەچۆن دەتوانێ ئەوشتە بەدەست بێنێت.

سبەینێ، کاتێ ویستت دڵی کەسێك ڕابکێشیت بۆئەوەی کارێك بکات، ئەوەت لەبیربێت.بۆنمونە: ئەگەر ویستت کوڕەکەت جگەرەنەکێشێ بەئامۆژگاری مەکە وباسی ئەوەیشی بۆمەکە کەخۆت حەزت لێیەتی.بەڵکو بۆی ڕوون بکەرەوە کەلەوانەیە جگەرەکێشان ببێتەهۆی دواخستنی لەیاری(بایسبۆڵ) یان لە(ڕاکردن)دا.

زۆرباشترە ئەو ڕاستیەت لەبیربێت، ئیترهەڵس وکەوت لەگەڵ منالدا بکەیت یاخود لەگەڵ مەیموندا.بۆنمونە: ڕۆژێکیان(ڕۆلف والدۆ ئەمرسۆن)وکوڕەکەی هەوڵیان ئەسپێك بخەنە تەویلەکەیەوە، بەلام ئەمانیش هەمان هەڵە بەربلاوەکەی ناوخەڵکیان دەکرد، هەڵەکەش بیرکردنەوەیە لەوەی خۆیان دەیانوسیت.ئەمرسۆن پالی دەنا وکوڕەکەیشی لەپێشەوە ڕای دەکێشا.کەچی ئەسپەکەش وەکوئەوانی دەکرد: ئەویش بیری لەوەدەکردەوە کەخۆی دەیویست.قاچەکانی

لەزەوی توندکرد وبەهیچ شێوەیەك ملی نەئەدا بەوەی لەوەرگاکە بەجێ بهێڵێت.

کارەکەرێکی ئیرلەندایی ئەو دیمەنەی بینی... ئەوئافرەتە نەیدەزانی وتاربنوسێت وکتێب دابنێت.وەڵێ(بەلای کەمەوە لەم بوارەدا) لەئەمرسۆن زیاتر شارەزای حیکمەتی ئەسپەکەبوو.بیری لەوە کردەوە کەئەسپەکە دەیویست.هات پەنجەی خستە دەمی ئەسپەکەوە تاکو بیمژێت.ئیدی بەوشێوەیە ئەسپەکەی بردە ناوتەویلەکەوە.

هەموو ئەوکارانەی لەکاتی لەدایك بوونتەوە تائێستا کردوتن، بەهۆی ویست وخواستی خۆتەوە بووە.ئەی ڕات چی بووکاتێ برە پارەیەکت بەخشیە خاچی سور؟ بەڵێ، تەنانەت ئەم کارەش لەویاسایەی لێی دەدوێین ڕیزپەڕنابێت.تۆبۆیە پارەت بەخشیوەتە خاچی سوور چونکە ویستوتە هاوکاریەك پێشکەش بکەیت وکارێکی مرۆۃ دۆستانەی پیرۆزبکەیت.

چونکە ئەگەرئەم هەستەت پترلەپارە کەلامەبەست نەبوایە، هەرگیز پارەت نەدەبەخشی.بێگومان، یان لەوانەیە بۆیە پارەت بەخشیبێ، چونکەشەرمت کردوە لەوەی پارەنەبەخشیت، یان لەبەرئەوە بوو کەسێك داوای ئەوەی لێکردویت... بەڵام شتێك هەیە جێگەی دڵنیاییە، ئەویش ئەوەیە تۆبۆیە ئەوپارەیەت بەخشیوە، چونکە لەوپارە بەخشینەدا ئارەزوت لەشتێ بووە کەبەو هۆیەوە دەست گیرت بێ.

پرۆفیسۆر (هاری ا.ئۆفرستریت)لەپەرتوکە بەناوبانگەکەیدا: (**التأثير بالتصرف الانساني**)دەڵێت: (لەبنەڕەتەوە کارلەئارەزوی ئێمەوە هەڵدەتوڵێت... باشترین ئامۆژگاریش بۆئەوکەسانەی هەوڵی قەناعەت

پێکردن دەدەن لەکاردا یان لەماڵ وقوتابخانە وسیاسەتیشدا ئەوەیە: یەکەم، لەناخی کەسی بەرانبەرتدا ئارەزوویەك دروست بکە، هەرکەس بتوانێ وابکات هەموو جیهان هی ئەوە، هەرکەسیش نەتوانێ بەتەنهایی رێگەکە دەبڕێ).

(ئەندریۆ کارنگی) ئەوگەنجە ئۆسکۆتلەندایيە هەژارەی کەلەسەرەتاوە لەبەرانبەر کاتژمێرێ کارکردندا دووسەنتی وەردەگرت، کەچی دواترسێ سەد وشەست وپێنج ملیۆن دۆلاری کۆکردەوە.هەرلەسەرەتای ژیانیەوە فێری ئەوڕاستیەببوو کەتاکەرێگە بۆئەوەی کاریگەری لەسەرخەڵك دابنێیت بریتیە لەباسکردنی ئەوشتانەی کەکەسی بەرانبەر ئارەزوی لێیەتی... ئەندریۆ تەنها چوارساڵ ڕۆشتە قوتابخانە، لەگەڵ ئەوەشدا فێربوو چۆن هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکیدابکات. نمونەیەك لەوبارەیەوە: خوشکی هاوسەرەکەی زۆرنیگەران بووسەبارەت بەهەردوو کوڕەکەی کەلە(ییل)بوون. ئەو دوو کوڕە بەتەواوی نغرۆ وسەرقاڵی نێوکار وبارەتایبەتیەکانیان ببوون. بەئەندازەیەك نەیان دەپەرژایە سەرنەوەی نامەی بۆبنوسن، یان هیچ نەبێ وەڵامی ئەو نامانە بدەنەوە کە دایکە هەژارەکەیان بۆی دەناردن.

کارنگی گرەوی لەسەر سەد دۆلارکرد، کەدەتوانێ نامەیەك بۆئەو دووکوڕە بنوسێت ولەڕێی پۆستەشەوە وەڵامەکەی وەربگرێتەوە، بەبێ ئەوەی خۆیشی داوای وەڵامیان لێ بکات. ئەوەبوو نامەیەکی بۆهەر دوو کوڕەکەی نوسی وتیایدا گوتبووی نیازی وایە یەکی پێنج دۆلاریان بۆبنێرێت.

وەڵێ لەبیری چوو بوو پارەکەبخاتە ناونامەکەوە.هێندەی نەبرد لەڕێی پۆستەوە وەڵامی نامەکەی وەرگرتەوە وتیایدا سوپاسی مامەئەندرێی خۆشەویستیان کردبوو لەسەرئەونامەجوانە- ئیتر تۆش خۆت دەتوانی ڕستەکە تەواوبکەیت.

لەوانەیە تۆش ئارەزوت لەوەبێ کەسێك واڵێ بکەیت کارێك بکات.وەڵێ بەرلەوەی هیچ قسەیەك بکەیت.ڕابوەستە ولەخۆت بپرسە: (چۆن دەتوانم وای لێ بکەم حەزی لەکردنی ئەوکارەبێت؟ )

ئەم پرسیارە ڕێدەگرێت لەوەی باسی ئارەزووەکانی خۆمان بۆخەڵك بکەین... ماوەیەك ڕاهاتبووم لەسەر ئەوەی لەئوتێلێکی شاری نیویۆرکدا هەموو وەرزێك بۆماوەی بیست شەو هۆڵێکم بەکرێ دەگرت بۆئەوەی وتاری تیابدەم و وانەی تێدا بڵێمەوە. لە سەرەتای وەرزێکدا، سەرسام بووم کاتێ زانیم دەبێ سێ بەرانبەر کرێ بدەم لەچاو وەرزی پێشوو.ئەم هەواڵەم دوای ئەوەپێگەیشت کە کاستەکانی من چاپ وبڵاوکرابونەوە وهەموو ڕێ وشوێنەی پێویستیەکانم گرتبوویە بەر.

ئاسایی، من حەزم لەوە نەبوو ئەوکرێ زیادەیە بدەم، بەڵام چ سودێکی هەیە گەرمن بچمە لای خاوەنی ئوتێلەکە وباسی ئەو حەزەی خۆمی بۆبکەم؟ ئاخەر ئەوان تەنهابایەخ بەوە ئەدەن کەخۆیان دەیانەوێت... بەو جۆرە، لەپاش دوو ڕۆژ، ڕۆشتم بۆچاوپێکەوتنی بەڕێوەبەرەکە.پێم گوت: (کەنامەکەتم خوێندەوە کەمێك سەرسام بووم.بەڵام هەرگیز لۆمەت ناکەم.ئەگەرمنیش لەجێگەکەی تۆدابام، هەمان شتم دەنوسی.چونکە ئەرکی تۆ وەك بەڕێوەبەرێك ئەوەیە زۆرترین سود وقازانج کۆبکەیتەوە.ئەگەر وانەکەیت دەردەکرێیت و، لەوحاڵەتەشدا پێویستە

دەربکرێیت.ئێستاش باپارچەکاغەزێ بێنین وئەوچاکە وخراپانە بنوسین کەبەسەر تۆدادێت ئەگەر هەرسوربیت لەسەر داوای زیادکردنی کرێی هۆڵەکە.

پارچەکاغەزەکەم هێناولەناوەڕاستیدا هێڵێکم دروست کرد وکردمە دووبەشەوە وبەشێکیانم ناونا(باشیەکان) ئەویتریانم ناونا(خراپەکان)... لەژێر(باشیەکان)دا نوسیم: هۆڵی ئاهەنگێڕان بەبەتاڵی، ئەمەشتێکی باشە، چونکە دەتوانیت بەکرێی بدەیت بۆئاهەنگی سەما وکۆڕ وکۆبونەوەی تر، دیارە لەوەشدا قازانجی زیاتردەکەیت وەك لەزنجیرەی کۆڕێکی بیست شەوی.ئەگەر لەماوەی وەرزێکدا تەنها بیست شەو هۆڵەکە بەکرێ بدەیت، بێگومان زیانێکی گەورەت کردووە.

ئێستاش با بابیرلەخراپەکان بکەینەوە، یەکەم، بەرلەوەی تۆ لەڕێی منەوە داهاتی خۆت زیادبکەیت، بەپێچەوانەوە داهاتەکانت کەم دەکەیتەوە.لەڕاستیشدا ئەو داهاتانە بەتەواوی دەبڕێت، چونکە من ناتوانم ئەوکرێیە بدەم.بۆیە ناچاردەبم لەجێگەیەکی تردا ئەو وانانە پێشکەش بکەم.

جگەلەوە خراپەیەکی تریشی هەیە.کۆڕ و وتارەکانی من دەبنەهۆی ئەوەی ڕۆشنبیر وخوێندەوارەکان ڕووبکەنە ئوتێلەکەت.ڕیکلامەکەی من زۆرباشە بۆتۆ، ئەی وانیە؟ لەڕاستیدا، تۆپێنج هەزار دۆلار دەدەیت بەکرێی ڕیکلام لەڕۆژنامەکاندا، کەچی هەرناتوانیت، وەکومن کەسانێکی زۆر کۆبکەیتەوە و، پەلکێشیان بکەیت بۆئەوەی بێن ئوتێلەکەت ببینن، ئەی وانیە؟ .

وەکو گوتم، ئەم خراپانەم لەژێر ناونیشانی گونجاوی خۆیدا دانا.دواترکاغەزەکەم دایە دەستی بەڕێوەبەرەکە وپێم گوت: (هیوادارم بەوردی لەچاکی وخراپییەکان بکۆڵیتەوە ودواتر بڕیاری کۆتایتم پێ ڕابگەیەنیت).

ڕۆژی دواتر، نامەیەکم پێ گەیی تیایدا ئاگاداری کردبومەوە کەکرێکە(٥٠٪) زیاد دەکات، لەبری(٣٠٠٪)!!.

بەبیریشت دەخەمەوە ئەم نرخ وداشکانەیشم دەستکەوت لەکاتێکدا بەهیچ جۆرێ باسی ئەوەم نەکردبوو کەخۆم حەزم لێی بوو، تەنها باسی ئەوەم کرد کەبەرانبەرەکەم خوازیاری بوو.

باوای دابنێین منیش کارێکی ئاسایی ومرۆیانەم بکردایە، بۆنمونە خۆم توڕە بکردایە وبم گوتایە: یانی چی داوای زیاد کردنی (٣٠٠٪)ی کرێ دەکەیت، لەکاتێکدا باش دەزانیت من بلیتەکانم چاپ کردوە وکۆڕەکانیش ئاشکراکراون؟ (٣٠٠٪)! قسەیەکی هیچ وپوچ وبێ مانایە!ئەو زیادەیە نادەم!.

ئەوکاتە چی ڕووی دەدا؟ شەڕەقسە ودەم تێکگیران-خۆشت باش دەزانی دەم تێکگیران بەچی کۆتایی دێت-تەنانەت ئەگەر قەناعەتیشم پێ بکردایە کەبەهەڵەدا چووە، هێشتر کیبریا وخۆبەزلزانینی ئەوپیاوە ڕێگەیان دەگرت لەوەی مل بەڕاستیەکان بدات.

بفەرموو، ئەوە تۆ وباشترین پەندکە لەهونەری پەیوەندیە مرۆییەکاندا پێشکەش کراون.فۆرد ئەڵێت: (ئەگەر هەرنهێنیەك هەبێت بۆسەرکەوتن، ئەوا لەوەدایە کەدیدوبۆچونی بەرانبەرەکەت بزانیت ولەگۆشەنیگای ئەویش وخۆیشتەوە شتەکان ببینیت).

زۆرباشه، دەمەوێت دووبارەی بکەمەوە: ( ئەگەر هەرنهێنییەك هەبێت بۆسەرکەوتن، ئەوا لەوەدایە کەدیدوبۆچوونی بەرانبەرەکەت بزانیت ولەگۆشەنیگای ئەویش وخۆیشتەوە شتەکان ببینیت) ئەمەشتێکی زۆر ڕوون وئاساییە، تەنانەت هەر مرۆڤێك بگری دەتوانێت بەیەك نیگا ڕاستییەکەی بۆ دەربکەوێت.کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەسەدا نەوەدی خەڵکی سەرئەم زەویە فەرامۆشی دەکەن.دەتەوێ نمونەیەکت لەوبارەیەوە بدەمێ؟ سەرنجی ئەو نامانەبدە کەڕۆژی دووشەممە دێنە نوسینگەکەت.ئەوجا دەیبینیت زۆربەی ئەونامانە بنەمای لۆژیك پێشێل دەکەن.باوەکو نمونە ئەم نامەیە وەربگرین.نامەکە سەرۆکی فەرمانگەی ڕادیۆ ئاراستەی ئاژانسێکی ڕیکلامی کردووە کەنوسینگەی لەهەموو کیشوەردا هەیە.ئەم نامەیە ئاراستەی هەموو بەڕێوەبەرایەتی ڕادیۆکان لەوڵاتدا کراوە(من لەنێوکەوانەدا دیدوبۆچوونی خۆمم لەسەر هەربڕگەیەکی نامەکە نوسیوە).

بەڕێز ژۆن بلاك،

بلانکفیل، ئیندیانا.

خۆشەویستم بەڕێزبلانك:

کۆمپانیای... بەنیازە پێگەی خۆی لەڕابەرایەتی کردنی ڕیکلامی ڕادیۆیی بەدەست بێنێتەوە.

(کێ بایەخ بەخواست وئارەزوی کۆمپانیاکەی تۆئەدات؟ من سەرقاڵی کێشەکانی خۆمم، سبەینێ بانك خانوەکەم دەخاتە ڕەهنەوە، دوێنێ بازاڕی بۆرسە دابەزی، شەمەندەفەرەکەی هەشت وچارەکی بەیانیشم لەدەست دەرچوو، بانگهێشتی ئەو ئاهەنگی دانسەش نەکرام

کەخانەوادەی بەڕێز جۆنزسازیان کردبوو. پزیشکەکەشم پێی ڕاگەیاندم فشاری خوێنم بەرزە و... لەپاش ئەم هەموو شتە، چی ڕوو دەدا؟ سبەینێ بەدوودڵیەوە دەچمەنوسینگەکەم، بەوحاڵەوە دێم نامەکان دەکەمەوە دەبینم ئەوهیچ وپوچە باسی خواست وئارەزووی کۆمپانیاکەیم بۆ دەکات.ئەگەر بزانێت نامەکەی چ کاریگەرییەك دروست دەکات، ئەوا کارکردنی لەبواری ڕیکلامدا بەجێ دەهێڵا ودەبوە شوانی مێگەل).

حساباتی ئێمە هەمیشەپارێزەری تۆڕی ڕادیۆبووە. ولەکاتی گونجاریشدا باجەکانی داوە... ئاژانسەکەمان ساڵ لەدوای ساڵ لەبەرەوپێشەوە چوندایە.

(تۆمەزنیت ولەلوتکەدایت.وانیە؟ ئەمە یانی چی؟ ئاخەرمن هیچ گرنگیەك نادەم بەوەی تۆمەزنیت یان نا؟ ، تەنانەت ئەگەر هاوشانی جەنراڵ مۆتۆرز وجەنراڵ ئەلکتریك ودەستەی گشتی سوپای ئەمریکاش بیت پێکەوە... تەنانەت ئەگەرحیکمەت ودانایی بولبولیشت هەبێت، خۆت باش دەزانیت کەمن گرنگی بەخۆم وقەبارە ودۆخی خۆم ئەدەم- نەك بەتۆ وبەوقسانەت کەباس لەگەورەیی وسەرکەوتنەکانت دەکەن، هەستی ئەوەلای من دروست دەکەن بەسەرخۆما بشکێمەوە وهەست بەبچوکی وهیچ وپوچی خۆم بکەم).

ئێمەخوازیارین حساباتەکەمان لەکۆتادێرەکانی زانیاریەکانی ئێستگەکەدا دابنرێن.

(تۆ دەتەوێت!تۆ دەتەوێت. ئاخەر ئەی گەوجی نەفام... من هیچ بایەخ نادەم بەوەی تۆدەتەوێت.یان ئەوەی مۆسۆلینی وکروسپی دەیانەوێت.

لیم گەڕێ بانەوەت پێ بڵێم کەمن دەمەوێت.ئەوەی کەتۆ لەنامەهیچ وپوچەکەتدا هیچت لەبارەیەوە نەگوتووە).

ئایا دەتوانیت ناوی کۆمپانیاکەمان بخەیتە نێولیستی ئەفزەڵیەتەوە لەپرسگەی هەفتانەی ئێستگەدا-هەر وورده‌کاریەکیش ئەگەر لەکاتی گونجاودا بڵاوبکرێتەوە لەبەرژەوەندی ئاژانسەکەدا دەبێت.

(لیستی ئەفزەڵیەت.ئەوێریت باسی لیستی ئەفزەڵیەت بکەیت! ئەوەندەباسی گەورەیی کۆمپانیاکەت ئەکەیت، وام لێ دەکەیت هەست بەبێ بایەخی خۆم بکەم-کەچی دواتر داوام لێدەکەیت بتخەمە نێو لیستی ئەفزەڵیەتەوە... تەنانەت کاتێ ئەو داوایەش دەکەیت ناڵێیت: (تکادەکەم!)...

بۆیادخستنەوەش لەکۆتایی نامەکەدا، ئەگەر دوایەمین دەستکەوتەکانتانمان پێ بدەیت، سودێکی هاوبەشی لێ دەبینین.

(ئەی بێ ئەقڵ!لەلایەکەوە نامەیەکی بێ نرخ وپرژم بۆدەنێریت.پرژ وەکو گەڵاهەڵوەریوەکانی پایز.لەلایەکی تریشەوە ئەوێریت داوام لێ بکەیت.داوام لێ دەکەیت لەکاتێکدا سەرقاڵی گرفتەکانی خۆم وڕەهنیماڵەکەم وبەرزبونەوەی فشاری خوێنەکەمم. بێم دابنیشم ونامەیەك بۆتۆ پڕبکەمەوە دەربارەی گەورەیی کۆمپانیاکەت. جگەلەوە داواشم لێ دەکەیت بەپەلە وبێ خاوەخاوکردن ئەوکارەت بۆبکەم.ئەرێ مەبەستت لە"بەبێ خاوەخاوکردن" چیە؟ ئەی نازانیت منیش وەکوتۆ سەرقاڵم؟ یان لانی کەم حەزدەکەم وابیربکەمەوە کەسەرقاڵم! ئینجا کاتێ ئێمە لەم بابەتە دەدوێین، کێ ئەو مافە پیرۆزەی پێداویت کەفەرمان بەسەرمندا بدەیت؟ ...

تۆدەڵێیت: (ئەوە لەبەرژەوەندی هەردوولامانە) بەم دواییانە خەریکە لەگۆشەنیگای منەوە شتەکان دەبینیت.بەڵام هەر تەم ومژت هەیە لەوەدا کەچۆن ئەوشتە لەبەرژەوەندی منداەبێت).

تێ بینی: ڕوونوسێك لەڕۆژنامەی بلانکفیل هەیە، لەوانەیە بتەوێت لەڕادیۆکەتەوە بیخوێنیتەوە...

(دواجار، تێبینیەکت داوەکە یارمەیتم دەدات بۆچارەکردنی یەکێك لەگرفتەکانم.ئەویش ئەوەیە کەبۆچی نامەکەت بەوشێوەیە دەست پێ نەکردوە-بەڵام تازەسودی چیە؟ هەرپیاوێ وەکو تۆ تاوانبارێت بەکردنی قسەی بێ ئەقڵانە، هەردەبێ ناتەواویەك لەئەقڵیداهەبێت،کەواتە تۆپێویستت بەنامەیەك نیە کەدوایەمین دەستکەوتەکانی ئێمەت پێ ڕابگەیەنێت، بەڵکو پێویستت بەچارەکە پەرداخێك لەدەرمانی یۆد هەیە بۆغودە دەرەقیەکەت).

ئەگەر مرۆڤێك ژیانی خۆی بۆبواری ڕیکلام تەرخان کردبێت وشارەزا ولێزان بێت لەهونەری کاریگەری دانان لەسەرخەڵك، نامەیەکی ئاوها بنوسێت، ئەی ئەبێ چاوەڕوان بین قەساب ونانەوا وجوڵاچی بنوسن؟ .

نامەیەکی ترهەیە کەبەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی بارکردن بۆ بەڕێز(ئیدواردفیرمیلین)ی نوسیوە کەیەکێك لەقوتابیەکانی پەیمانگاکەم... ئایا ئەو نامەیە چ کاریگەریەکی دروستکرد لەسەرئەو کەسەی کەبۆی نوسرابوو؟ جارێ نامەکە بخوێنەرەوە، دواجارپێت ڕادەگەیەنم چ کاریگەریەکی دروستکرد.

*کۆمپانیای کوڕانی ا.زیریگاد*

*٢٨ فرۆنت ستریت*

*برۆکلین، نیویۆرك*

بەڕێزان، زۆربەی پرۆسەکانی بارکردن لەکۆمپانیاکەماندا دووچاری فەلەجی بووە، چونکە ڕێژەی زۆری کەلوپەلەکانمان لەدوانیوەڕۆدا بۆدەنێردرێن. ئەمەش دەبێت هۆی مۆڵدرانی کەل وپەلەکان وکارکردنی زیادەی ئێمەش. هەروەهادەشبێتەهۆی ئەوەی ئۆتۆمبیلە باربەرەکان دوابکەون چ لەداگرتن یاخود لەبارکردنیاندا. ڕۆژی ١٠ی تشرینی دووەم، لەکۆمپانیاکەی ئێوەوە بارێکمان بۆهات لەکاتژمێر چوار وچارەکی پاش نیوەڕۆدا کەپێکهاتبوولە(٥١٠)پارچە. خۆشحاڵین بەهاوکاریتان بۆزاڵبوون بەسەر ئەنجامە نەخوازراوەکاندا وهەروەها بۆسەرکەوتن بەسەر دواکەوتنی تەسلیم کردنی کەلوپەلەکاندا... ئایا دەتوانین داوای ئەوەتان لێ بکەین ئەگەر بارێکی گەورەی وەك بارەکەی ئەوڕۆژەتان هەبوو، لەپێش نیوەڕۆدا بۆمان بنێرن؟ .

سودی ئەوەش بۆئێوە، ئەوەیە کەبارەکانتان زوتربەتاڵ دەکرێن وکارەکانتان بەپەلە ڕایی دەکرێن.

*دڵسۆزتان ج.ب.سویت*

لەپاش خوێندنەوەی ئەونامەیە، بەڕێز فیرمیلین، بەڕێوەبەری بەشی فرۆشتن لەکۆمپانیای ناوبراو، نامەکەی بۆناردم لەگەڵ ئەم توانجەدا: (ئەم نامەیە بەرەنجامێکی پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆیی هەبوو. ئەولەسەرەتاوە باسی ئەو ناڕەحەتیانە دەکات کەدێنەڕێی کۆمپانیاکە، دیارە ئەوەش لای ئێمەگرنگ نیە. دواتردێت داوا لەئێمە دەکات یارمەتییان بدەین بەبێ ئەوەی بیرلەوە بکاتەوە ئایا ئەو یارمەتی دانە بۆئێمە گونجاوە یان نا. دواجار، لەکۆتابڕگەدا، بیری دەکەوێتەوە ئەگەر ئێمە هاوکاری بکەین، مانای وایە بارەکانمان زوو بەزوو خاڵی

دەكرێن وكارەكانمان رادەپەڕێنرێن... بەدەربڕینێكی تر: ئەولە دوابڕگەكانی نامەكەیدا باسی ئەوەدەكات كەبەلای ئێمەوە گرنگە، ئەمەش ڕۆحێكی دوژمنكارانە لای ئێمە دروست دەكات نەك ڕۆحی هاوكاری).

باسەرنج بدەین لەوەی دەتوانین دووبارە ئەونامەیە رێك بخەینەوە بەبێ ئەوەی باسی كێشەو گرفتەكانی خۆمان بكەین و، لەدیدی بەرانبەرەكەمان وخۆشمانەوە شتەكان ببینین.وەك (هنری فۆرد)دەڵێت.لێرەدا شێوازێك بۆداڕشتنەوەی نامەكە دەخەینە بەرچاو، ڕەنگە باشترین شێوازیش نەبێت بەڵام پێشنیارێكە لەوبارەیەوە.

*بەڕێز ئیدوارد فیرمیلین*

*كۆمپانیای كوڕانی ا.زیریگا*

*٢٨ فرۆنت ستریت برۆكلین*

*نیویۆرك*

*خۆشەویستم بەڕێز فیرمیلین:*

كۆمپانیاكەی بەڕێزتان لەچواردەساڵی ڕابردوودا باشترین مامەڵەچی بووە لەگەڵ ئێمەدا، بۆیە ئاسایی، ئێمە هەست بەمنەتباری دەكەین بەرانبەرتان وئاواتەخوازین بتوانین ڕاژەی خێرا وكاریگەری شایستەی خۆتانتان پێشكەش بكەین.بەڵام، جێگەی نیگەرانیشمانە كەدەبێ بڵێین ناتوانین ئەو خزمەتگوزاریەتان پێشكەش بكەین لەبەر ئەوەی لۆریەكانی ئێوە بارەگەورەكانیان لەدوانیوەڕۆدا دەگەیەننەئێمە.وەك ئەوەی ڕۆژی (١/١٠ )ڕوویدا.بۆچی؟ لەبەرئەوەی زۆربەی مامەڵەچیەكانی تریشمان هەرلەدوای نیوەڕۆدا كاڵاكانیان دەگەیەنن.بۆیە شتێكی ئاساییە كاڵاكان

بەسەرماندا کەڵەکە ببن.ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی داگرتن وبارکردنی بارهەڵگرەکانی ئێوەش دوابکەوێت.

ئەمەش کارێکی زۆر خراپ ونەخوازراوە، بەڵام دەتوانین خۆمان لەو کارەخراپە دووربخەینەوە ئەگەر بتوانن بارەکانتان بەر لەنیوەڕۆ بگەیەنن، بەوشێوەیە لۆریەکانیشتان بواریان دەبێ سەرلەبەیانیان بەئازادی جموجوڵ بکەن، ئێمەش بایەخ بەبارکردنیان دەدەین.کرێکارەکانیشمان سبەینێ سەرلەئێوارە دەگەڕێنەوە وشێوێك لەو مەعکەرۆنە بەتامە دەخۆن کەئێوە دروستی دەکەن.

هیوادارم ئەمە بەبێ تاقەتی لەقەڵەم نەدەیت، هیوادارم واش تێ نەگەیت ڕەخنە لەشێوەی بەڕێوەبردنی کارەکانت دەگرم، چونکە ئەم نامەیە بەمەبەستی باشتر خزمەت کردنی تۆنوسراوە.

هەرکاتێ بارەکانت بگەن، خۆشحاڵ دەبین خزمەتت بکەین.

دەزانم سەرقاڵیت، هیوادارم خۆت هیلاك نەکەیت بەوە لامدانەوەی نامەکەوە.

*دڵسۆزتان ج.ب.سویت*

هەزاران فرۆشیاری دەستگێڕی سەر شۆستەکان بە هیلاکی وشەکەتی دێن ودەچن ولەژێرکۆڵی قورسی قەرزاریدا دەناڵێنن. بۆچی؟ ... چونکە تەنها بیرلەوە دەکەنەوە کەخۆیان دەیانەوێت.ئەوان نازانن کەئێمە نامانەوێت هیچ شتێ بکڕین، ئەگەر بشمانەوێ شتێ بکڕین، دەڕۆین دەیکڕین.وەڵێ هەموومان بیرمان بەلای چارەسەرکردنی گرفتەکانمانەوە.هەرکاتێ کابرای فرۆشیاری دەستگێڕتوانی کالاوخزمەتگوزاریەکانیمان پێشکەش بکات وبیخاتە قاڵبی

چارەسەرکردنی گرفتەکانمانەوەیە، ئەوکاتەپێویستی نابێ بەوەی پێمان بفرۆشـێ، بـەڵکو ئێمـە پێویـستمان دەبـێ بـەوەی کاڵاکـانی بکـڕین.هـەرکڕیارێ بگـری حـەزی بەوەیـە شتەکەبکڕێ، نـەك پێـی بفرۆشرێ.لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی زۆر هەن ژیانیان لەکڕین وفرۆشتندا بەسـەردەبەن، بـەبێ ئـەوەی بتـوانن شـتەکان لەگۆشـەنیگای کڕیـار ومامەڵەچیەکانیانەوە ببینن.بۆنمونـە: من لـە(فرۆست هیڵـن) دەژیم کـە کۆمەڵـەماڵێکی تایبەتـە لەناوەڕاسـتی نیویۆرکـدا.ڕۆژێکیـان کەبـەپڕتاو بەرەو وێستگە دەڕۆشتم، چاوم کەوت بەکابرایەك کەکاتی خۆی لە(لۆنگ ئایلەند) دەڵاڵی کڕین وفرۆشتنی زەوی بوو.ئەو زۆرباش (فرۆست هیڵن) شارەزابوو.بەپەلە بەرەو ڕوی ڕۆشتم تاکو پرسیاری ئەوەی لێ بکەم ئایا خانوەکەم بەکۆنکرێتی مسەلەح دروستکراوە یان بەمادەی (جفصین). لە وەڵامدا گـوتی: نـازانم.دواتـر شتێکی پـێ گـوتم کـەمن خۆیشم ئـەوەم دەزانـی.گـوتی: دەتـوانی لەڕێگـەی پەیوەنـدی کردنتـەوە بەکۆمەڵـەی باخـچەکانی فرۆسـت هیڵـزەوە وەڵامـی پرسـیارەکەت دەسـت بکەوێت.بۆسبەینێ سەرلەبەیانی، نامەیەکم لەوکابرایەوە پێگەیشت.ئایا لـەو نامەیـەدا وەڵامـی پرسـیارەکەمی دابویـەوە؟ ئـەو هەرلەسـەرەتاوە دەیتوانی بەیـەك خولـەك لەڕێگـەی تەلەفونـەوە وەڵامی پرسیارەکەم بۆ وەربگرێتـەوە.بـەڵام وای نـەکرد.کەچی لەنامەکەیشیدا ڕێنمونی ئـەوەی کردبووم گوایـە دەتـوانم بـە تەلـەفۆن وەڵامەکـەم وەرگـرم!!داوای ئـەوەی کردبوو کەسەرپەرشتی کاروبارەکـانی دڵنیـایی(تـأمین) یمن لە ئەستۆ بگرێت.

ئەوهیچ بایەخێكی بەیارمەتی دانی من نەئەدا.بەڵكوتەنها مەبەستی یارمەتی دانی خۆی بوو.لەوحاڵەتەدا دەبوا نوسخەی هەریەك لەو دوو پەرتوكە نایابەكەی (فاش یونگما)ی بدەمێ: (فرۆشیاری دەستگیڕ) و(كانزایەك بۆبەشداری).

جائەگەر ئەوپیاوە ئەو دوو كتێبەی بخوێندایەتەوە وبنەماكانیانی جێبەجێ بكردایە.ئەوا چەندین بەرانبەری ئەوە قازانجی دەست دەكەوت كەتەئمینی ژیانی من یان خانوەكەم لەئەستۆبگرێ.

پسپۆڕەكانیش هەمان هەڵە دووبارە دەكەنەوە.چەند ساڵێك لەمەوبەر، چومە عەیادەی پسپۆڕێكی قوڕگ ولوت وگوێ لە شاری فیلادلفیا.ئەوپزیشكە تەنانەت بەرلەوەی چاوێك بگێڕێت بەناو دەممدا، پرسیاری ئەوەی لێكردم كەئایا چ كارێك دەكەم!.ئەو بایەخی بەلەوزەكەم وهەڵاوسانی قوڕگم نەئەدا، بەڵكو تەنها گوێی بەبڕی ئەو پارەیە ئەدا كەلەمنی دەبچڕێ بۆخۆی!!مەبەستی ئەوە نەبوو یارمەتی من بدا، تەنها مەبەستی بوو زۆرترین پارەم لێ بكێشێتەوە. لەئەنجامیشدا هیچی لێم دەست نەكەوت.چونكە لەعەیادەكەی چومەدەرەوە وزۆریش بێتاقەت بووم لەكەم ئەدەبی ئەوكابرایە.جیهان پڕەلەو جۆرە كەسانە: كەسانی خۆپەسەند... ئەوكەسە دەگمەنانەش كەدەیانەوێت بەبێ خۆپەرستی خزمەتی خەڵكی بكەن، هەڵگری كۆمەڵێ خەسڵەتی گەورەن.كەسانێكی زۆركەمیش هەن بتوانن ڕكابەری ئەوكەسە دەگمەنانەبكەن. ئۆنی یۆنگ دەڵێت: (هەركەسێك بتوانێ خۆی بخاتە جێگەی كەسی بەرانبەری، هەروەهابتوانێ ئەوەی لەمێشكی بەرانبەرەكەیدایە بیخوێنێتەوە ولێی تێ

بکات، ئەوکەسە هەرگیز پێویستی بەدوودڵی نابێت سەبارەت بەوەی قەدەرێۆی حەشاردراوە).

ئەگەر لەم پەرتوکەوە تەنیا شتێك دەست بکەوێت: ئارەزووی ئەوەت دەست بکەوێت کەلەگۆشەنیگای بەرانبەرەکەتەوە بیربکەیتەوە وشتەکان ببینیت-ئەوە ڕەنگە ببێتەبەردی بناغەیەك وڕێڕەوی ژیانت بگۆڕێت.

زۆربەی خەڵك دەڕۆنە زانکۆ وفێری خوێندنەوە وجەبرولێکدانەوەی ژمێرە ناڕەحەتەکانیش دەبن، بەبی ئەوەی بزانن مێشکیان چۆن کاردەکات.بۆنمونە: من وانەی : (پەیڤی گاریگەر)م دەگوت بەکۆمەڵێ لەوگەنجانەی زانکۆ کەبەڕێوەبوون بچنە کۆمپانیای (کاریر) لەشاری(نیویۆرك) لەویلایەتی(نیوجرسی).کاری ئەو کۆمپانیایەش بریتیە لەبەڵێندەرایەتی دامەزراندنی سیستەمی فێنك کردنەوەی نوسینگە وهۆڵ وشانۆکان.جارێکیان پیاوێ ویستی ئەوانی تر واڵێ بکات یاری(تۆپی باسکە)بکەن... بزانە چی بەوکۆمەڵە قوتابیەدەگوت...

دەیگوت: (من حەزم لەیاری تۆپی باسکەیە، دەمەوێ هەمووتان یاری باسکەبکەن.کاتێ دەچووم بۆیاری جمباز، ژمارەیەکی تەواو نەبوو بۆئەوەی یاری باسکەبکەین.شەوی ڕابردوو تەنها دووسێ کەس هەبوو تۆپ هەڵبدەین. هەربەهۆی ئەوەشەوە بۆکسێ بەرچاوم کەوت، دەمەوێت ئەمشەو بێن، من دەمەوێت یاری باسکەبکەین).

ئایا ئەوپیاوە باسی شتێکی کردوە کەتۆبتەوێت؟ تۆناتەوێت بچیت بۆ یاریگای جومباز کەهیچ کەس ڕووی تێناکات، وانیە؟ هیچ گوێیش نادەیت بەحەزوئارەزوەکانی بەرانبەرەکانت.تۆ ناتەوێ زەربەیەك بەرچاوت بکەوێ.

دەتـەوێت پێـت بڵـێم لـەیاری جومبـازدا چـەند سـوود وەردەگرین، بەدڵنیاییـەوە. چـالاکیەکی زیـاتر، ئارەزوویـەکی زۆرتـر بـۆ خـواردن، مێشکێکی ساف، ڕابواردن ویاری کردن.

بائامۆژگاریەکەی مامۆستا(ئۆفرستریت) دووبارە بکەینەوە کەدەڵێت: (هـەوڵ بدەلـەناخی بەرانبەرەکەتدا ئارەزوو دروست بکـەیت، هەرکـەس بتوانـێ وابکـات، هـەموو جیهـان هـی ئـەوە، هەرکەسـیش نـەتوانێت، بەتەنهایی ڕێگە کەدەبڕێ).

یـــەکێك لەقوتابیـــەکانی پەیمانگاکـــەم زۆر دوودڵ بـــوو بەرانبـــەر بەکوڕەبچکۆلەکەی کەکێشی کەم بوو، کەچی لەگەڵ کەمبونی کێشیدا، خواردنیشی نەدەخوارد، دایك وباوکی هەمیشە ڕێگە کلاسیکیەکانیان لەگەڵدابەکار دەهێنا.لێی توڕەدەبوون وپێیان دەگەوت: (دایکت دەیەوێت ئەوەبخۆیت، باوکت دەیەوێت گەورەببیت و، ببیتە پیاوێکی مەزن).

بەڵام ئایا کوڕەکە گوێی بەم قسانە دەدا؟ دروست وەك چۆن تۆ بایەخ بەورگەردیلـە خۆڵانـە نـەدەیت کـەڕاخراون بەڕۆخەکانـدا! مەگـەرپیاوێ حیکمەتی ئەسپی هەبێت، چاوەڕوان بکات منداڵێکی سێ ساڵانە، لەگەڵ بیر وبۆچونەکانی باوکیدا خۆی بگونجێنێت کەتەمەنی لەسی ساڵیدایە.

بـاوکی منداڵەکـە ئـەوەی دەویـست.بـەڵام هـیچ سودێکی نـەبوو.دواتر دەردەکەی دۆزیەوە،لەدڵی خۆیدا گوتی: (منداڵەکەم چی دەوێت؟ چۆن دەتوانم داواکەی ئەو لەگەڵ خواستی خۆمدا بگونجێنم؟ ). هەرکە دەستی بەبیرکردنـــەوە کـــرد، چارەســـەری گرفتەکـــە لەبەردەمیـــدا ئاســـان بوو.منداڵەکەی پاسکیلێکی سێ تـایی هـەبوو، حـەزی لـەوەبوو لەبـەردەم ماڵی خۆیاندا بەتەنیشت شەقامەکەوە پاسکیلەکەی لێ بخوڕێت، لەنزیك

ماڵیشیاندا، منداڵێكی هار وهاج هەبوو، هەركەنەمی لەسەرپاسكیلەكە بدیایە، دەهات پاڵێكی پێوەدەنا وپاسكیلەكەی لێ دەستاند وخۆی لێی دەخوڕی.

ئاسایی، منداڵەكەش دەستی بەگریان دەكرد ودەهاتەوە بۆلای دایكی، دایكیشی ناچاردەبوو، دەچوە دەرەوە وپاسكیلەكەی لەمنداڵە هار وهاجەكە وەردەگرتەوە.ڕۆژانە ئەم شانۆگەریە دووبارە دەبوویەوە. كەواتە منداڵەبچكۆلەكە چی دەویست؟ وەلامەكە پێویستی بەوەنیە پرسیار لە(شیرلوك هۆلمز) بكەین... ئارەزووی ئەو بۆ هەستكردن بەگرنگی خۆی، هەروەها ڕق وتوڕەییە كەیشی پاڵیان پێوە دەنا بۆتۆڵەكردنەوە وشكاندنی لوتی منالە هارەكە.بۆیە كاتێ باوكی پێی گوت ئەگەر هەموو ئەوشتانە بخوات كەدایكی بۆی دادەنێ، ئەوجائەم دەتوانێ منداڵەكەی بۆفەلاقە دەكات، واتە كاتێ باوكی بەڵێنی دایە منداڵەكەی بۆفەلاقە بكات، هیچ گرفتێ لەئارادانەما وهەموو ئەوخواردنانەی دایكی بۆی دەهێنادەیخوارد.بۆ ئەوەی گەورەو بەهێز ببێت وپۆرتی ئەو منداڵە هاروهاجە بشكێنێ كەبەردەوام ئازاری ئەدات وگاڵتەی پێ دەكات.

لەپاش چارەسەركردنی ئەو گرفتە، باوكی ڕوو بەڕووی گرفتێكی تربوویەوە: منداڵەكە خوویەكی خراپی هەبوو، شەوانە میزی بەخۆیدا دەكرد.

منداڵەكە لەگەڵ نەنكی‌دا دەخەوت، هەمیشە كەنەنكی لەخەو ڕادەبوو نوینەكەی بەتەڕی دەبینی پێی دەگوت: (ژۆنی!بڕوانە دووبارە چیت

کردوە)کەچی منداڵەکە وەڵامی دەدایەوە: (من وام نەکردوە، تۆ واتکردوە!).

ئەم ڕەخنەوچەلەحانێیە هیچ سودێکی نەبوو.باوکی پرسیاری کرد: (چۆن دەتوانیت میزبەخۆدا کردنی شەوانە بەمنداڵەکەمان تەرک بکەین؟ ).

داخوازیەکانی منداڵەکەچی بوون؟ یەکەم، دەیویست وەکو باوکی بیجامە لەپێ بکات، نەك وەکو نەنکی کراسێکی ئاودامانی درێژ لەبەر بکات.جا لەبەرئەوەی نەنکی لەهەڵس وکەوتەکانی بێتاقەت ببوو، بەخۆشحاڵیەوە بیجامەی بۆکڕی تاکو ئەو هەڵس وکەوتە دووبارە نەکاتەوە!دووەم، دەیویست نوێنێکی تایبەت بەخۆی هەبێت.نەنکی ڕێگری ئەم داخوازیەشی لێنەکرد.

بۆڕۆژی دواتر، دایکی دەستی گرت وبردی بۆ پێشانگاکانی (لۆزەر)لەبرۆکلین، بەئاماژەیەك ژنەفرۆشیارەکەی تێگەیاندو گوتی: (ئەو پیاوە بچکۆلەیە دەیەوێت شت بکڕێ.

ژنەفرۆشیارەکەش وایکرد منداڵەکە هەست بەگرنگی خۆی بکات.بۆیە گوتی: کاکە!دەتەوێت چیت پیشان بدەم؟ .

منداڵەکە بەشانازیەوە ڕاوەستا وگوتی: (ئەمەوێ نوێنێك بۆخۆم بکڕم.

کاتێ ئەونوێنەیان پیشاندا کەپێشتر دایکی بۆی هەڵبژاردبوو، دایکی ئاماژەی دایە ژنەفرۆشیارەکە تاکو منداڵەکەی بۆقایل بکات بەوەی ئەو نوێنەبکڕێت.

ڕۆژی دواتـر نوێنەکـە درایـە دەسـتیان.بۆیـە ئێـوارە کاتـێ بـاوکی گەڕایـەوە.بەپەلـە ڕای کـردە بـەردەرگا وهـاواری دەکـرد(بابـە!بابـە! وەرە بڕوانە نوێنم کڕیوە!).

بـاوکی تەماشـایەکی نوێنەکـەی کـرد وهـەمان ئامۆژگـاری (چارلزشـواب)ی پێڕەوکـرد(ڕاسـتگۆبوو لەستایـشکردنیدا و، زیادەڕەویشی کردلە مەدح کردنیدا)پاشان لێی پرسی: (خۆئەم نوێنە تەڕناکەیت، وانیە؟ ).

-نا، نەوەڵا.هەرگیز میزی پیاناکەم.

هەربەڕاسـتیش، منداڵەکـە پارێزگـاری لـەم بەڵێنـەی کـرد، چـونکە کەرامـەتی ڕێگـەی نەئـەدا پەیمانەکـەی بـشکێنێت.نوێنەکـەی نـوێنی خۆیـەتی وخۆی کڕیویـەتی.وەکوپیـاوێکی بچکۆلانەش بیجامـەی لـەپی کردووە.بۆیە ویستی بەکردەوەش وەکو پیاو ڕەفتاربکات.

(ولیـەم ویـنتر)دەڵێـت: (تەعبیرلـەخۆ کردن، پێویـستیەکی پێداگرانەیـە لەسروشتی مرۆیـدا).کەواتـە بۆچـی ئـەم ڕاستیە لـەبواری کارکردنیشدا بەکارنـەهێنین؟ باهـەرکاتێ بیرۆکەیـەکی جوانمـان لاگەڵاڵـەبوو، لـەبری ئەوەی بەرانبەرەکەمان هەست بکات بیرۆکەی ئێمەیە، باوای لێ بکەین ئەو بیکوڵێنێـت وبڕوای وابێـت بیرۆکـەی خۆیـەتی، بـەوجۆرە خۆشەویستی بیرۆکەکە دەچێتە دڵیەوە وڕەنگە دووژەمیشی لێ بخوات.

لـەبیرت نەچێ: ( هـەوڵ بـدە لـەناخی بەرانبەرەکەتدا ئارەزوو دروست بکەیت، هەرکەس بتوانێ وابکات، هـەموو جیهان هی ئەوە، هەرکەسیش نەتوانێت، بەتەنهایی ڕێگەکە دەبڕی).

# بەشی یانزەیەم

## ئاوابکە، بۆهەرکوێ بچیت پێشوازیت لێ دەکرێ.

بۆچی ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، تاکو بۆت دەربکەوێت چۆن دەتوانیت هاوڕێ بۆ خۆت دروست بکەیت؟ بۆچی چاو لەگەورەترین کەسب کەری هاوڕێ لەجیهاندا نەکەین؟ . لەوانەیە سبەینێ چاوت پێی بکەوێ کەبەسەر شەقامەکەدا دەڕوات.کاتێ لێی نزیك دەبیتەوە، دەست دەکات بەکلکەلەقێ.ئەگەر ڕایشی بهێنی، دەست دەکاتە بازبازێن وخۆشەویستی خۆیت بۆدەردەبڕێ. تۆیاش دەزانیت لەپشتی ئەم خۆشەویستیەوە هیچ هۆکارێکی شاردراوەنیە.ئەو نایەوێت پارچە زەویەکت پێ بفرۆشێت یان هاوسەرگیریت لەگەڵدابکات!.

ئایا تۆهەرگیز بیرت لەوە کردۆتەوە کە(سەگ) تاکە ئاژەڵێکە، هیچ کارێك ناکات لەپێناوی ئەو خۆراکەیدا کەدەستی دەکەوێ؟ مریشك دەبێ هێلکە بکات. چێڵ دەبێ شیرمان بداتێ. بولبول دەبێ بخوێنێ. تەنها سەگ لەبەرانبەر خۆراك وبژێویەکەیدا، هیچت ناداتێ، جگەلە خۆشەویستی. لەتەمەنی پێنج ساڵیدابووم، باوکم توتکەیەکی بەپەنجاسەنت بۆکریم، ئەو توتکەیە ببوویە سەرچاوەی هەموو خۆشی

وبەختەوەریەکانم. دوانیوەڕۆی هەموو ڕۆژێک، دەورووبەری کاتژمێر چوارونیو، لەبەردەم ژوورەکەی پێشەوە دادەنیشت وچاوە جوانەکانی دەبڕیە ڕاڕەوەکە. هەرکەگوێی لەدەنگی من دەبوو، وەك تیر دەردەپەڕی بۆلام، تاکو بەحەپەیەکی جوان سڵاوم لێ بکات.

(تیبی) بۆماوەی پێنج ساڵی تەواو هاوڕێم بوو. پاشان، لەشەوێکی خەمناکدا کەهەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، تیبی لەدووری دەپێ لەژوور سەری منەوە بە هەورە بروسکە کوژرا. مردنی تیبی کارەساتی سەردەمی منداڵیم بوو. تیبی گیان! تۆ هیچ پەرتوکێکی دەروونناسیت نەخوێندبویەوە. پێویستیشت بەخوێندنەوەی وەها کتێبێك نەبوو. تۆلەمیانەی غەریزەکانتەوە دەتزانی هەرکەسێك دەتوانێت لەماوەی دوومانگدا لەڕێگەی گرنگیدانیەوە بەبەرانبەرەکەی، زیاتر لەوە هاوڕێ بۆخۆی پەیدا بکات کە لەماوەی دووساڵدا هەوڵی بۆئەدات لەڕێی ڕاکێشانی سەرنجی بەرانبەرەکانی بۆ ئەوەی گرنگی پێ بدەن. لێم گەڕێ بادووبارەی بکەمەوە: تۆدەتوانی لەمیانەی بایەخدانتەوە بەبەرانبەرەکانت لەماوەی دوومانگدا زیاد لەوە هاوڕێ پەیدابکەیت کەلەماوەی دووساڵدا هەوڵی بۆ ئەدەیت لەڕێی سەرنج ڕاکێشانی بەرانبەرەکانتەوە بۆئەوەی گرنگیت پێ بدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، منیش وتۆش کەسانێك دەناسین کەلەژیاندا هەڵەدەکەن، کاتێ هەوڵ ئەدەن دڵی بەرانبەرەکانیان ڕابکێشن بۆ ئەوەی بایەخیان پێ بدەن.

ئاسایی، ئەو کارە کارێکی بێ سودە. چونکە خەڵکی نەبایەخ بەتۆ ئەدەن ونەبەمن. بەڵکو ڕۆژتانیوارە، تەنها گرنگی بەخۆیان ئەدەن.

کۆمپانیای تەلەفونی نیویۆرك، لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەنجامدا، تاکو بۆی دەربکەوێت کام وشە لەکاتی گفتوگۆکاندا زۆرتر دووبارە دەبێتەوە.
لەئەنجامدا دەرکەوت: ڕاناوی (من) زۆرترین دووبارە بونەوەی هەیە، چونکە لە(٥٠٠) گفتوگۆی تەلەفۆنیدا (٣٩٩٠جار) دووبارە بوەتەوە!.

کاتێ سەرنج لەکۆمەڵێ وێنەی فۆتۆگرافی خۆت ئەدەیت، یەکەمجار چاو بۆ کام وێنە دەگێڕیت؟ .

ئەگەر وادەزانیت خەڵکی بایەخت پێ ئەدەن، لەخۆت بپرسە: ئەگەر ئەمشەو بمرم، چەند کەس دەچن بۆ پرسەکەم؟ !.

بۆچی پێویستە خەڵك گرنگی بەتۆ بدەن، ئەگەر تۆ پێشتر گرنگیت بەوان نەدابێ؟ پێنوسەکەت ئامادەبکە و.وەڵامەکەت بنوسە:

ئەگەر تەنها بمانەوێت خەڵکی گرنگیمان پێ بدەن.ئەوا هاوڕێی دڵسۆزمان دەست ناکەوێ.هاوڕێی ڕاستەقینە بەو شێوەیە کەسب ناکرێ.

ناپلیۆن ئەو ڕێگەیەی تاقی کردەوە، بۆیە لەدوا چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ جۆزفینداگوتی: (جۆزفین، منیش وەك هەرپیاوێکی تری سەرئەم گۆی زەمینە بەخت یاوەرم بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، لەم ساتەدا، تۆتاکە کەسێکی کەلەم جیهانەدا دەتوانم پشتی پێ ببەستم) ئەمە لەکاتێکدا مێژونوسەکان تەنانەت گومان لەوەش دەکەن کەئەو توانیبێتی پشت بەجۆزفینیش ببەستێ .

زانای دەرونناسی بەناوبانگ(ئەلفرد ئەدلەر) کتێبێکی نوسیوە بەناوی : (پێویستە ژیان بۆتۆ، چ مانایەك ببەخشێت).لەوپەرتوکەدا دەڵێت: (ئەو مرۆڤەی کەگوێ نادات بەبرا مرۆڤەکەی تری، لەژیاندا دووچاری چەندین گرفت وناڕەحەتی دەبێتەوە، لەهەمان کاتیشدا دەبێتە

هۆی قوڵترین زام بۆ ئەوانی تریش، هەر لەنێو ئەو جۆرە کەسانەشدا شکستە مرۆییەکان سەر هەڵئەدەن).

لەوانەیە لەنێو کتێبەدەروونناسیەکاندا تێبینی هاوشێوەی ئەم تێ بینیەت خوێندبێتەوە.بەڵام دەربڕینێکی بەسودترلەم دەربڕینەت بەرچاو نەکەوتوە.

من ڕقم لەدووبارەکردنەوەیە.وەلێ دەربڕینەکەی (ئەدلەر) زۆر دەوڵەمەندە بەواتای جوان.لەبەرئەوە، لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە: ( ئەو مرۆڤەی کەگوێ نادات بەبرا مرۆڤەکەی تری، لەژیاندا دووچاری چەندین گرفت وناڕەحەتی دەبێتەوە، لەهەمان کاتیشدا دەبێتە هۆی قوڵترین زام بۆ ئەوانی تریش، هەر لەنێو ئەو جۆرە کەسانەشدا شکستە مرۆییەکان سەر هەڵئەدەن)جارێکیان لەزانکۆی نیویۆرك لەبارەی هونەری نوسینی چیرۆکی بچوکەوە دەم خوێند.سەرنوسەر( کولییر) لەیەکێك لەپۆلەکاندا گوتی: من دەتوانم لەنێو دەیان چیرۆکدا کەڕۆژانە پێمان دەگات، یەك چیرۆك هەڵبژێرم.لەپاش خوێندنەوەی چەند بڕگەیەکی کەمی چیرۆکە کە، تێدەگەم لەوەی نوسەرەکەی خەڵکی خۆش دەوێت یان نا: (ئەگەر نوسەر خەڵکی خۆش نەوێت، ئەوا چیرۆکەکانیشی خۆش ناوێت).

ئەم نوسەرە بەتوانایە، دووجار قسەکانی بڕی وداوای لێبووردنی کرد لەوەی کەخەریکە ئامۆژگاری پێشکەش دەکات.دواتر گوتی: (منیش وادیارە هەمان شتتان پێدەڵێم کەواعیزەکان پێتان دەڵێن.بەڵام لەبیرتان بێت، ئەگەر بتانەوێ ببنە نوسەری سەرکەوتوو، پێویستە خەڵکتان خۆش بوێت).

ئەگەر بۆنوسینی چیرۆك ئەم قسەیە ڕاست بێت.ئەوا دڵنیابە لەکاتی مامەڵـەکردنی ڕوو بـەڕوو لەگـەڵ خەڵکیـدا، ڕاسـت تـرە. ئێوارەیـەکم لەژووری جلوبەرگەکانی (هوارد تۆرستۆن)دا بەسەر برد لە(برود وای)... سورستۆن جادوگەرێکی ناسراوە، ئەوپیاوە لەماوەی چل ساڵدا هەموو جیهـان گـەڕاوە وجموجـوڵی تەمومـژداری وای نیشان داوە کەبینـەرانی سەرسام کردووە.نزیکەی شەست ملیۆن بینەر لەسەرتاسەری جیهاندا پارەیـان داوە بۆبینینی کارەکـانی.لەئەنجامـدا نزیکـەی دوومليـۆن دۆلار قازانجی کۆکردۆتەوە.

داوام لەبەڕێز(سۆرستۆن)کرد تاکولەنهێنی سەرکەوتنەکەی لەژیاندا، ئاگـادارم بکـات.بێگومـان زانست هـیچ پەیوەندیـەکی بـەو کارانـەوە نیە کەئەو دەیانکـات.چونکە ئەوبەمنداڵی لـەماڵ ڕایکـردوە.بەهـەرزەکاریش لەسەرشـەقام وشۆسـتەکاندا دەخـەوت و بـەدەرۆزە کـردنیش خـواردنی بۆخۆی پەیدا دەکرد.

ئایا ئـەوپیاوە شارەزاییەکی زۆری هـەبوو لەجادوکردنـدا؟ نەخێر. ئەو خـــۆی باســـی ئـــەوەی بـــۆکردم کەســـەدان پـــەرتوك لـــەبارەی یاریەشـاردراوەکانەوە هەیـە، کەسـانێکی زۆریـش وەکـو ئەوناشـنان بەو کتێبانـە.بـەڵام دوو تایبەتمەنـدی لەخۆیـدا دەبینـی کەلەکەسـانی تـردا نین.یەکەم تایبەتمەندی ئەوەیە کە نمایشکارێکی شـارەزایەو دەتوانێ کەسایەتی خـۆی بخاتـە بـەر ڕۆشـنایی. شارەزایشی هەیـە لەسروشـتی مـرۆڤ.هەرچـی کـرداریَ ئـەنجامی ئـەدات، هەرجوڵەیـەك، هـەر دەنگێـك، تەنانـەت جوڵەکانی برۆیشی بەوردی دیراسـە دەکـرد، بەرلـەوەی دەسـت بەنمایشەکانی بکات.سەرباری ئەوەش(سۆرستۆن) بایەخێکی زۆری ئەدا

بەخەڵك. خۆی بەمنی گوت: زۆرباشە، کۆمەڵێ خەڵکی گەمژە لەبەردەمدان ومنیش بەجوڵەکانم گاڵتەیان پێ دەکەم) بەڵام شێوازی کاری سۆرستۆن تەواو لەوان جودایە.ئەوهەرکاتێ دەچێتە سەرتەختی شانۆ لەناخی خۆیدا دەڵێت: (زۆر هەست بەمنەتباری دەکەم کەئەوخەڵکە هاتوون من ببینن. ئەوان یارمەتیم دەدەن بەشێوەیەکی باشتر، بژێوی خۆم پەیدابکەم.لەبەر ئەوە، هەرچی لەتوانامدابێت بۆیان دەکەم). هەروەها باسی ئەوەیشی بۆکردم کەهیچ هەنگاوێ نانێ بەرەو تەختی شانۆ، ئەگەر لەدڵی خۆیدا نەڵێت: (جەماوەرەکەم خۆش دەوێ.جەماوەرەکەمم خۆش دەوێ) ئایا ئەمە شتێکی هیچ وپوچە؟ تۆی خوێنەر دەتوانی بیرلەوەبکەیتەوە.من بەبێ هیچ توانجێ دەینوسمەوە!.

خاتوو(شۆمان هینك)یش سەرباری برسێتی وناڕەحەتی.سەرباری ئەوەی کەناسۆرەکانی ژیانی خەریك بوو پاڵی پێوە بنێن بۆخۆکوشتن وکوشتنی منداڵەکانیشی، سەرباری هەموو ئەونەهامەتیانە، کەچی توانی گۆرانی بڵێت وببێتە یەکێك لەدرەوشاوەترین ئەستێرەکانی ئۆپێرا.ئەمیش دانی بەوڕاستیە دانا کەیەکێك لەنهێنیەکانی سەرکەوتنەکەی بریتیە لەگرنگی دانی بەخەڵك.

هەرئەم هۆکارەش یەکێکە لەنهێنیەکانی سەرکەوتن وجەماوەرداریەکەی تیۆدۆر ڕۆزڤلت. ئەم پیاوە تەنانەت خزمەتکارەکانیشی خۆشیان دەویست.(جیمس ا.ئەموس) کەیەکێك بوو لەخزمەتکارە تایبەتەکانی، کتێبێکی نوسیوە بەناوی(تیۆدۆر ڕۆزڤلت، قارەمانی خزمەتکارە تایبەتەکەی) لەو پەرتوکەدا ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە:

جارێکیان هاوسەرەکەم پرسیاری ئەوەی کرد لە سەرۆک کەڵای (کەو)چۆنە؟ چونکە پێشتر کەوی نەبینیبوو.ئەویش زۆر بەوردی وەسفی کەوی بۆکرد.کەچی پاش ماوەیەك، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا(ئەموس وهاوسەرەکەی لەکەرتی ڕۆزڤلت لەئۆیستربای دەژیان).هاوسەرەکەم وەڵامی دایەوە، خودی سەرۆك لەسەر هێڵی تەلەفۆن بوو.بەهاوسەرەکەمی گوتبوو: ئێستا کەوێك لەدەرەوەی پەنجەرەکەتدایە ودەتوانی بەئاسانی بیبینی.ئەم جۆرەشتە وردانە ڕۆزڤلتیان لەهەرکەسێکی ئاسایی جیادەکردەوە.هەرکاتێکیش بەلای ماڵەکەماندا تێپەڕ ببوایە. سڵاوێکی گەرم ودڵسۆزانەی لێدەکردین. ئایا کارمەندەکان دەتوانن پیاوێکی ئاوایان خۆش نەوێت؟ چۆن مرۆڤ دەتوانێت پیاوێکی وای خۆش نەوێت؟ .

ڕۆژێك سەرۆك ڕۆزڤلت سەردانێکی کۆشکی سپی دەکات، ئەوکاتە سەرۆك تافت وهاوسەرەکەی لەدەرەوە بوون.لەو سەردانەدا خۆشەویستی خۆیی بۆخەڵکە سادەکەی ئەوێ دەبڕی، لەڕێی سڵاوکردنیەوە لەهەموو حزمەتگوزارە دێرینەکانی کۆشك. بەناوی خۆیانەوە. تەنانەت سڵاویشی لەچێشت پەزەکانی چێشتخانەکەی کۆشکی سپی کرد.

(ئەرشی بات) دەنوسێت ودەڵێت: (کاتێ سەرۆك چاوی بەئەلیسی خزمەتگوزاری چێشتخانە کەوت، پرسیاری ئەوەی لێکرد ئایا تائێستاش نانی زەڕات سازدەکات.ئەلیس گوتی: زۆرجار بۆخزمەتکارەکانی سازدەکەم، بەڵام ئەوانەی لەنهۆمی سەرەوەدان نایخۆن.ڕۆزڤلت گوتی:

ئەوان ئارەزوویان لەگەڵ خواردنا ساغ نیە، هەرکەچاوم بەسەرۆك کەوت باسی ئانە زەڕاتەکەی تۆی لەگەڵدا دەکەم)!.

ئەلیس لەسەر دەوریەکی بچوك پارچەیەك لەونانەی بۆهێنا، ڕۆزڤلت پارچەنانەکەی هەڵگرت وبەرە ونوسینگەکەی چوو، سڵاویشی لەکرێکار وباخەوانەکانیش دەکرد.وەك جاران، هەرکەسێکی بەناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بانگ دەکرد، تائێستاش زۆربەی کارمەندەکانی کۆشك باسی ئەو ڕوداوە دەکەن.(ئیك هۆڤر) بەچاوی پڕلە فرمێسکەوە گوتی: (ئەو ڕۆژە، لە ماوەی دووساڵدا خۆشترین ڕۆژمان بوو، هیچ کەس ئەو ڕۆژە ناگۆڕێتەوە بەسەد دۆلار).لەمیانەی ئەزمونی تایبەتی خۆمەوە، بۆم دەرکەوتووە کەمرۆڤ دەتوانێ بایەخ وکات وهاوکاری لەزۆربەی کەسایەتیە دیار وبالآکانی ئەمریکاوە بەدەست بێنێ.ئەمیشە لەمیانەی گرنگیدانی ڕاستەقینە پێیان. بانمونەیەك وەربگرین:

چەند ساڵێ لەمەوبەر، لەدامەزراوەی بروکلین بۆ هونەر وزانستەکان، وانەی هونەری نوسینی چیرۆکم دەگوتەوە.حەزمان کرد بانگهێشتی هەندێ کەسایەتی ناوداربکەین.وەك: (کاسلین نوریس، فانی هرست، ئیداتاربیل، ئەلبرت باسیۆن، بویرت هیوز... هتد). تاکوبێن ولەئەزموتایبەتەکانیان سودمەندمان بکەن.بۆیە نامەمان بۆنوسین وتیایدا گوتبومان: ئێمە ڕێز دەگرین لەکارەکانتان ولەقوڵاییەکانی دڵمانەوە دەخوازین لە ئامۆژگاریەکانتان بێ بەشمان نەکەن ولەنهێنی سەرکەوتنتان ئاگادارمان بکەن.دواتر نزیکەی سەدوپەنجا قوتابی واژۆیان لەسەرنامەکان کرد.گوتمان: ئێمە دەزانین ئێوە سەرقاڵی کارکردنن. لەبەرئەوە ئەبادا نەتوانن وتارمان بۆبدەن.هاتین لەگەڵ هەر

نامەیەکدا لیستێ پرسیارمان کردە هاوپێچ.پرسیار سەبارەت بەشێوازی کارکردنیان. ئەوانیش ئەوەیان پی خۆش بوو.کێ هەیە ئەوەی پێ خۆش نەبێت؟ بۆیە ماڵیان بەجێ هێڵاو سەردانی برۆکلینیان کردبۆ یارمەتی دانی ئێمە.

بەهۆی ئەو شێوازەوە.هەریەکە لەم کەسایەتیانە قایل بوون بەوەی بێن لەپەیمانگاکەی مندا بۆ قوتابییەکان بدوێن: لیسلی م. شۆ، سکرتێرەی خەزێنە لەئەنجومەنی وەزیرانی تیۆدۆر ڕۆزڤلتدا.جۆرج و.ویکرشام، ئەمینداری گشتی لەئەنجومەنی تافتدا. ولیەم جێنگزبراین. فرانکلین ڕۆزڤلت... هتد.

هەمووومان، ئەگەر قەساب ونانەوا بین یان پادشابین ولەسەرتەخت دانیشتبین. هەموومان ئەوانەمان خۆش دەوێت کەڕێزمان دەگرن. قەیسەری ئەڵمانیا وەك نمونە وەربگرە.لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، یەکێك بوو لەپیاوە هەرە تاکڕەو و خۆ ویستەکان. تەنانەت کاتێ بەرەو هۆڵەندا هەڵهات بۆئەوەی گیانی خۆی ڕزگاربکات، هەموو وڵاتەکەی لێی ڕاپەڕین.ڕق و توڕەیی خەڵك لەو کابرایە ڕوو لەزیاد بوون بوو، بەئەندازەیەك ملیۆنەها کەس ئاواتەخوازبوون لەت وپەتی بکەن.لەناو ئەم دۆزەخی قینەدا، منداڵێك نامەیەکی سادەی نوسی بۆ قەیسەر، پڕبوو لەسۆز ودڵسۆزی.منداڵە کە گوتبووی.خەڵکی هەرچی بڵێن من هەر قەیسەرم خۆش دەوێ!!قەیسەر کەوتە ژێرکاریگەری ئەو نامەیەوە، منداڵەکەی بانگ کرد تاکوچاوی پێی بکەوێت. ئەوەبوو منداڵە کە ودایکی هاتن.قەیسەر دوایی دایکی ئەومنداڵەی مارەکرد.ئەو منداڵە پێویستی بەخوێندنەوەی کتێبی: (چۆن هاوڕێ دروست دەکەیت

وكاریگەری لەسەر خەڵك دادەنێیت) نەبوو، بەڵكو ئەو بەشێوەیەكی
ئەریزی ئەوەی دەزانی!.
ئەگەر بمانەوێت دۆست وهاوڕێ بۆ خۆمان دروست بكەین.باخۆمان
تەرخان بكەین بۆ خزمەتكردنی كەسانی تر، باهەندێ كاربكەین
كەپێویستی بەكات و وزەو بیركردنەوە دوركەوتنەوە لەخۆپەسەندی
هەیە.
كاتێ دۆق(وێندرسۆن) شازادەی وایڵز، بڕیاربوو گەشتێ بەباشوری
ئەمریكادا بكات. بەر لەوەی دەست بەگەشتەكەی بكات.چەند مانگێك
خۆی سەرقاڵی خوێندنی زمانی ئیسپانی كرد تاكو بتوانێ لەو جێگەیەی
بۆی دەچێ، بەزمانی خەڵكەكەی وتاربدات. ئەمریكاییە باشوریەكانیش
لەبەر ئەوە زۆریان خۆش دەویست.چەندساڵێك لەمەوبەر بڕیارمدا
ڕێكەوتی لەدایك بوونی هاوڕێكانم بدۆزمەوە.بەڵام چۆن؟ هەرچەندە
غەیبیش نازانم. بەپرسیارێك لەهاوەڵەكەم دەستم پێ دەكرد سەبارەت
بەوەی: ئایا ڕێكەوتی لەدایك بوونی مرۆڤ پەیوەندی بەكەسایەتی وپلە
وپایەی مرۆڤەوە هەیە؟ دواتر پرسیاری ڕێكەوتی لەدایك بونیم لێدەكرد.
ئەگەربۆ نمونە بیگوتایە (٢٤)ی تشرینی دووەم. لەدڵی خۆمدا دووبارەم
دەكردەوە(٢٤ی تشرینی دووەم... (٢٤ی تشرینی دووەم)هەركە ئاوڕی
بەلایەكدا ئەدایەوە، ناوەكەی ومێژوی لەدایك بونیم لەسەر لاپەڕەیەك
دەنوسیی.پاشان لەتیانوسی تایبەت بە بەروارەكاندا تۆمارم دەكرد.
كەڕۆژی دیاریكراو دەهاتە پێشەوە نامە یان بروسكەیەكم بۆدەنارد.ئەبێ
ئەو نامەیە چ كاریگەریەكی لەسەر دەروونی ئەوكەسانە دروست
كردبێت!ئەگەر بمانەوێت دۆست وهاوەڵ بۆخۆمان دروست بكەین.بابەدڵ

گەرمی ونەرم ونیانییەوە لەگەڵ بەرانبەرەکانماندا بدوێین. هەرکەسێکیش بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردیت، هەمان شێواز بەکاربێنە. بڵێ(سڵاو) بابەرانبەرەکەت هەست بکات کەتۆ حەزدەکەی قسەی لەگەڵدا بکەیت.کۆمپانیای نیویۆرک کارمەندەکانی خۆی ڕاهێناوە لەسەر ئەوەی کەبڵێن: (بەڕێز گیان، ژمارەکە چەندە) بەزمانێك وەك بڵێیت: (بەیانیت باش، خۆشحاڵم خزمەتت بکەم) بائەم قسەیەمان لەبیربێت ئەگەر سبەینێ وەڵامی پەیوەندیەکی تەلەفۆنیمان دایەوە.

بەڵام ئایا ئەم شێوازە بۆکاتی کارکردنیش بەسودە؟ دەتوانم بۆ وەڵامی‌ئەو پرسیارە چەندین نمونە بهێنمەوە.بەڵام لێرەدا دەرفەتی تەنها دوو نمونەمان هەیە.

(چارلز.واڵتەرز) بەڕێوەبەری یەکێك لەگەورەترین بانکەکانی نیویۆرك بوو، داوای لێکرا ڕاپۆرتێك سەبارەت بەکۆمپانیایەکی دیاریکراو ئامادەبکات.ئەم کابرایە پیاوێکی دەناسی، هەموو ئەوشتانەی ئەم پێویستی بوو لای ئەوپیاوە دەست دەکەوت: بۆیە ویستی چاوی بەوپیاوە بکەوێت، ئەم کابرایەش سەرۆکی کۆمپانیایەکی زەبەلاحی پیشەسازی بوو.کاتێ بەڕێز(وڵتەرز) کرایە ژوورەوە بۆنوسینگەکەی سەرۆك، کچە سکرتێرەکەی لەدرگاکەوە بەسەرۆکی گوت کەئەمڕۆ هیچ پوڵێکی لە لانیە.

(ئەو پولانە کۆدەکەمەوە بۆکوڕەکەم کەتەمەنی دوانزەساڵانە) سەرۆك هەڵوێستەکەی بەو جۆرە بۆ بەڕێز واڵتەرز شیکردەوە.

(بەڕێز واڵتەرز) دەستی کرد بەباسکردنی مەرامی هاتنەکەی وچەندپرسیارێکی ئاراستەکرد. بەڵام سەرۆك لەقسەکردن و وەڵامەکانیدا

ئەومەڕدار بوو. حەزی نەدەکرد قسەبکات. وادەردەکەوت شتێ نەبێ قەناعەتی پێ بکات بۆ ئەوەی قسەی بۆبکات. لەبەر ئەوە دیمانەکە وشك وبرنگ و کورت بوو. بەڕێز واڵتەرز لەکاتێکدا ئەم بەسەرهاتەی لەپۆلدا دەگێڕایەوە گوتی: (بەڕاشکاوی نەمدەزانی چی بکەم. دواتر ئەو قسەیەم بیرکەوتەوە کەلەبارەی پولەکانەوە سکرتێرەکەی بۆی کرد... بەبیرمداهات کەفەرمانگەی دەرەوەی بانکەکەمان پول کۆدەکاتەوە. پولی ئەونامانەی کەلەهەموو لایەکی دونیاوە ئاراستەی دەکرێن. پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر... دووبارە ڕۆشتمەوە بۆ چاوپێکەوتنی ئەوپیاوە: پێم گوت پولیشم پێیە بۆ کوڕە دوانزەساڵانەکەت. ئایا بەگەرم وگوڕییەوە ڕنگەیاندام بچمە ژورەوە؟ .بەڵێ گەورەم.

ئەونە بەگەرموگوڕیەکی واوە تەوقەی لەگەڵمدا کرد، کەئەگەر هەڵیش ببژێردرایە بۆ پۆستی سەرۆکی کۆنگریس، هەروا تەوقەی لەگەڵمدا دەکرد زەردەخەنەی دەبەخشیەوە... لەکاتێکدا پولەکانی ئەمدیو دیودەکرد. پەیتا پەیتادەیگوت: (جۆرج ئەمەیانی زۆر بەدڵ دەبێ!سەیری ئەمەیان بکە!زۆر جوانە).

ماوەی نیوکاتژمێر باسی پولمان کرد وسەرنجی وێنەی کوڕەکەی ئەوماندا، دواتر ماوەی کاتژمێرێکی لەکاتی خۆی بۆتەرخانکردم وهەموو ئەو زانیاریانەی پێویستم بوو، پێی دام-بەبێ ئەوەی خۆم داوای هیچی لێ بکەم. هەموو ئەوەی دەیزانی پێمی گوت. پاشان فەرمانبەرەکانی بانگ کرد وپرسیاری لێدەکردن. پەیوەندیشی کرد بەهەندێ لە یاریدە دەرەکانیەوە، هێندەی داتا وزانیاری وڕاپۆرت وژمارەپێدام کەبەتەواوی ئەستۆمی قورس کرد... ئیدی وام لێهات لەهەر ڕۆژنامە نوسێکی تر

زیاتر زانیاریم لەلاکەڵەکە بوو).(س.م.کنافل) لەفیلادلفیا هەوڵی ئەدا خەڵوز بفرۆشێتە کۆمپانیایەك.بەڵام کۆمپانیاکە هەوڵەکانی ڕەت دەکردەوە ونەیدەویست سوتەمەنی لەو بکڕێت.بەڕێز کنافل وتارێکی لەبەردەم قوتابییەکاندا پێشکەش کرد و، جامی ڕق وتوڕەیی خۆی ڕشت بەسەر کۆمپانیاکەدا و بەوەی پێناسەکرد کەنەفرەتە بەسەر ئەم نیشتمانەوە.هێشتر سەرسام بوو لەوەی کەبۆچی ناتوانێ سوتەمەنیەکەیان پێ بفرۆشێت.لەم کاتەدا من پێشنیارم بۆ کرد کەشێوازی ترپێڕەو بکات.بەکورتی فەرموو بزانەچی ڕویدا:

دیالۆگێکمان سازکرد لەنێوان دوو گروپدا، بابەتی دیالۆگەکەش بریتی بوو لەوەی: ( بڵاوبونەوەی گەنجینەی کۆمپانیا زنجیرەییەکان. زۆرتر زیان لەوڵات دەدەن وەك لەوەی سودی پێ بگەیەنن).

بەپێی پێشنیاری من، کنافل لایەنی نێگەتیڤی هەڵبژارد، قایل بوو بەوەی لە وتوێژەکەدا بەرگری لەو کۆمپانیایانە بکات کەلەڕاستیدا ڕقی لێیان بوو. بۆیە گوتی: (لێرەدا هەوڵ نادەم خەڵوز بفرۆشم، بەڵکو هاتووم داوای خزمەتێکتان لێ بکەم) دواتر دەستی کرد بەقسەوباس لەبارەی دیالۆگەکەوە.گوتی: (هاتوم داوای یارمەتی دەکەم چونکە بۆ ئەم هاوکارینە نەمتوانیوە زیاد لەتۆ بیرلەکەسی تربکەمەوە بتوانێ ئەو زانیاریانەم دەست بخات کەمن پێویستم پێیەتی، چونکە زۆر حەزدەکەم لەوتوێژەکەدا سەرکەوتن بەدەست بێنم.بۆیە لەقوڵایی دڵمەوە ڕێزلەهاوکاری کردنت دەگرم).

ئەمەی خوارەوەیش کۆتایی بەسەرهاتەکەیە، لەزمانی بەڕێز کنافڵ خۆیەوە:

داوام لێکرد خولەکێك لەکاتی خۆیم بۆتەرخان بکات.لەسەر ئەم بنەمایەش قایل بوو چاوی پێم بکەوێت.پاش ئەوەی کێشەکەی خۆمم بۆباسکرد، داوای لێکردم دابنیشم.بۆماوەی کاتژمێرێك وچل وحەوت خولەکیش لەگەڵمدا دووا.دواتر بەڕێوەبەرێکی تری بانگ کرد کەلەبارەی گەنجینە زنجیرییەکانەوە کتێبێکی دانابوو. ئینجا نوسراوێکی نوسی بۆ یەکێتی نیشتمانی گەنجینە زنجیرەییەکان تاکو ڕونوسێکم لەوبابەتە بۆ دابین بکەن.ئەو واهەست دەکات گەنجینە زنجیرەییەکان خزمەتێکی ڕاستەقینە بەمرۆڤایەتی دەکەن.بۆیە شانازیش دەکات بەوکارەی کەدەیکات لەپێناوی سەدان کۆمەڵەدا. لەکاتێکدا قسەی دەرکرد چاوەکانی دەبریکانەوە.پێویستە دان بەو ڕاستیەدا بنێم کەچاوی لەلاست هەندێ شت کردمەوە کەهەرگیز خەویشم پێوە نەدەبینی وبەتەواویش هەڵوێستی منیان گۆڕی. کاتێ لەنوسینگەکە هاتمەدەرەوە، تاکو درگاکە لەگەڵمدا هات.دای بەسەرشاندا وهیوای خواست لەوتوێژەکەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنم.هەروەها داوایشی لێکردم جارێکی تریش سەردانی بکەمەوە وهەواڵی ئەوەی پێ بدەم کە لە وتوێژەکەدا چ ئەنجامێکم بەدەست هێناوە.دوا قسەیشی ئەوە بوو کەپێی گوتم: (هیوادارم لەبەهاردا سەردانم بکەیت، چونکە من دەمەوێت ڕێکەوین لەسەر ئەوەی خەڵوزت لێ بکڕم).

ئەمە بۆمن وەکو جادویەك وابوو.چونکە خۆی پێشنیاری کرد خەڵوزم لێ بکڕێت، بەبێ ئەوەی من داوای هیچی لێ بکەم.لەماوەی دووکاتژمێر گرنگی دان بەخۆی وبەکێشەکانیدا، توانیم ئامانجێ بەدەست بێنم کەبە

دەسالّیش نەمدەتوانی بەدلّ ڕاکێشانی بۆکڕینی خەلّوز ئەو ئامانجە مسۆگەربکەم.

بەڕێزکنافلّ!تۆ نهێنیەکی تازەت نەدۆزیوەتەوە.چونکە سەدسالّ بەرلە زاین (بابلیۆس سیرۆس)ی هۆزانڤانی ڕۆمانی بەناوبانگ باسی لەوە کردوە کە: (ئێمە گرنگی نادەین بەوانی تر، تاکو ئەوان گرنگی بەئێمە نەدەن).

جائەگەر دەتەوێت خەلّکی خۆشیان بوێیت، ئەوا دەست بەم ڕێساگرنگەوە بگرە:

ڕووی گرنگیدانت وەربگێڕە بەلای ئەوانی تردا. ئەگەر دەتەوێت کەسایەتیەکی دەرکەوتە ونایاب بیت، خاوەنی لێهاتویی وبەهرەیەکی باش بیت لەبواری پەیوەندیە مرۆییەکاندا.لێم گەڕێ ئاماژەت بدەم بۆخوێندنەوەی پەرتوکی (گەڕانەوە بۆلای ئاین) کەلەنوسینی (دکتۆرلینك)ە. لەناونیشانی کتێبەکە مەترسە!!... چونکە بەڕاستی کتێبێکی نایاب وجوانە. یەکێك لە نۆژدارە بەناوبانگەکانی دەروونناسی داینـاوە کەپترلەسێ هەزارکەسی بینیوە وئامۆژگاری کردون وگوێی بۆکێشەو گرفتەکانیان گرتوە... (دکتۆر لینك) پێی گوتم کەزۆرئاسان بوو پەرتوکەکەی ناو بنایە(چۆن کەسایەتیت دروست دەکەیت).چونکە چارەسەری ئەوکێشەیە دەکات..تۆی خوێنەریش کاتێ دەیخوێنیتەوە، دەبینیت کتێبێکی سەرنج ڕاکێش وقەشەنگە.ئەگەر بیخوێنیتەوە وکار بەپێشنیارەکانی بکەیت.بێگومان پەرە بەبەهرە ولێهاتویت دەدەیت لەهەلّس وکەوت کردن لەگەلّ خەلّکیدا.

# بەشی دوانزدەیەم

## چۆن وادەکەیت دەست بەجێ خەڵکی خۆشیان بوێیت؟

لەڕیزدا ڕاوەستابووم، چاوەڕوانم دەکرد نامەیەك لەنوسینگەی پۆست لەشەقامی سیی وسیێ نیویۆرکدا تۆماربکەم. هەستم کرد فەرمانبەرەکە بێ تاقەت بووە لەکارەکەی، پولەکانی تەسیلم دەکرد، وەسڵەکانی دەبڕی، پاشماوەی پارەکەیشی دەگەڕاندەوە... لەدڵی خۆمدا گوتم: (هەوڵئەدەم کارێك بکەم ئەو کوڕەگەنجە خۆشی بوێم.ئەبێ قسەیەکی خۆش ونەرم ونیان بدەم بەگوێیدا.سەبارەت بەخۆم نا، بەڵکو سەبارەت بەخۆی)... ئینجا هاتم لەخۆم پرسی: (ئەبێ چی بڵێم کەلەستایش کردن وپیاهەڵدانی دا ڕاستگۆیم؟ ) وەڵامی ئەم پرسیارە ناڕەحەتە .بەتایبەت بۆکەسانێکی نەناس. وەلێ لەم حاڵەتەدا، مەسەلە کە ئاسان کەوتەوە.چونکە دەست بەجێ لەوگەنجەدا شتێکم بینی کەبەلامەوە جوان بوو.

بۆیە بەدڵگەرمیەوە پێم گوت: (چەندم پێ خۆشە کوڕەکەی منیش پرچی وەکو پرچی تۆوابێت).

بەڕویەکی خۆش وسەرسامیەوە سەیرێکی کردم وگوتی: (ئێستا وەکوجاران جوان نیە)بەلام دڵنیام کردەوە کەهەرچەندە هەندێ

لەجوانیەکەی لەدەست داوە، بەلام هێشتا زۆر جوانە.ئەم قسەیەی زۆر پێ خۆش بوو.وتوێژێکی بچکۆلە کەوتە نێوانمانەوە... لەکۆتایدا پێی گوتم: (زۆرکەس. پرچم بەجوان دەزانن).

گرەو دەکەم کەئەوگەنجە لەکاتی نان خواردنیشدا خەونی بەوقسەیەمەوە دیوە.گرەو دەکەم) کە گەڕاوەتەوە بۆماڵیشەوە، ئەو قسەیەی بۆهاوسەرەکەی گێڕاوەتەوە.یاخود تەماشای ئاوێنەی کردوە وگوتویەتی: (قژم جوانە)!.

جارێکیان لەبەردەم جەماوەرێکدا ئەم بەسەرهاتەم گێڕایەوە.لەپاشاندا یەکێك لێی پرسیم: (مەبەستت لەوقسەیە چی بوو؟ ).

مەبەستم چی بوو؟ ! مەبەستم چی بوو؟ !.

ئەگەر ئێمە هێندە خۆپەسەند بین، نەتوانین بەبێ بەرانبەر کەمێك خۆشحاڵی وستایشی ڕاستگۆیانە بگەیەنینە کەسێکی تر-ئەگەر گیانیشمان لەقەبارەی سێوێکدا بێت، ئەوا بێگومان ڕوو بەڕووی ئەوشکستە دەبینەوە کەشایستەی خۆمانە.

بەڵێ، من شتێکم لەوگەنجە دەویست کە بەپارەوپول مەزەندە ناکرێ، ئامانجەکەیشم هاتە دی.ئەو ئامانجەم هاتە دی کەمن شتێکم لەپێناوی ئەوگەنجەدا کرد، بەبێ ئەوەی ئەو هیچ بۆمن بکات.ئەم هەستەش بەردەوام لەیاوەریتدا دەمێنێتەوە تەنانەت پاش ئەوەی ڕوداوەکەش بەسەردەچێ وتێ دەپەڕێت. یاسایەکی زۆرگرنگ هەیە لەهەڵس وکەوتە مرۆییەکاندا. ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو یاسایەبین.هەرگیز ناکەوینە نێو هەڵەوە.لەڕاستیشدا، ئەگەر ئەو یاسایە جێ بەجێ بکەین ژمارەیەکی زۆد وزەوەند لەهاوڕێ وئاشنامان بۆپەیدا دەکات.وەڵێ هەرگا لەویاسایە

دەرچوین.دەکەوینە نێو دونیایەك کێشەی بێ کۆتاییەوە، یاساکەش ئەمەیە: وابکە کەسی بەرانبەرت هەست بەبایەخی خۆی بکات.

دکتۆر(ژۆن دیوی)دەڵێت: ئارەزوکردنی بایەخداری، قوڵترین هاندەرەلەنێو سروشتی مرۆڤایەتیدا... پرۆفیسۆر(ولیەم جیمس)دەڵێت: قوڵترین پرەنسیپ لەسروشتی مرۆڤدا، بریتیە لە بەدەست هێنانی ستایش.وەك لەبەردا ئاماژەم پێدا.ئەم هەستە ئەو هاندەریەکە جیامان دەکاتەوە لەئاژەڵەکانی تر و، هەرئەم هەستەش بەرپرسیارە لەبەرهەم هێنانی شارستانیەت.

هەزاران ساڵ لەمەوبەر فەیلەسوفەکان سەرنجی یاساورێساکانی پەیوەندیە مرۆییەکانیان داوە. لەسەرجەم ئەو سەرنج وتێرامانانەدا یەك یاسای گرنگ بەرهەم هێنراوە، یاساکە شتێکی تازەنیە، بەڵکوچەندە مێژو کۆنە ئەویش هێندە کۆنە.(زوروستر) لەئێراندا سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر ئاگرپەرستەکانی فێری ئەو یاسایە دەکرد.بیست وچوار سەدەش بەرلەئێستا کۆنفۆشیۆس ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد دەستی پێوەبگرن.هەروەها(لاوتسی) دامەزرێنەری (تاویەت) (یەکەم بنەما کەهەموو بونەوەری لێوە دروست بووە) بنەماکانی ئەو یاسایەی لە(دۆڵی هان)دابڵاو دەکردەوە.(بودا)ش لەسەر ڕۆخەکانی ڕوباری (گانج)ی پیرۆزدا، پێنج سەدساڵ بەرلە زاین برەوی بەویاسایە ئەدا. پەرتوکە پیرۆزەکانی هندۆسیش هەزارساڵ بەر لەوبەرەوارە ئەو یاسایانەیان بڵاو دەکردەوە.مەسیحیش لەسەر بەرزاییەکانی یەهودای پیرۆز، نۆزدە سەدە بەرلەئێستایەهەمان ئەویاسایەی فێری خەڵك دەکرد... مەسیح هەموو ئەویاسایەی لەیەك دێڕدا کۆکردۆتەوە.ڕەنگە گرنگترین یاسابێت

لەجیهانــدا، کــەدەڵێت: (مامەڵــە لەگــەڵ خەڵکیــدا بەوشــێوەیە بکــە کەحەزدەکەیت خەڵکی لەگەڵ خۆتدا مامەڵەبکەن).

تۆڕەفتاری باشت دەوێ لەوکەسانەی هەڵس وکەوتیان لەگەڵ دەکەیت، دەتــەوێ دان بــە بــەهای ڕاستەقینەتدا بنێن. هــەروەها دەتــەوێت هەست بکەیت بەوەی لەجیهانە بچکۆلانەکەتدا کەسێکی بایەخداریت. ناتــەوێ گوێبیــستی پیاهەڵــدانێکی درۆزنانــەبێت. بــەڵکو خوازیــاری ستایــشی ڕاســتگۆیانەیت. دەتــەوێت هــاوڕێ ویاریــدەدەرەکانت، وەك ئــەوەبن کــە(چارلزشواب)دەڵێــت: (ڕاستگۆبن لەستایــشدا وزیــادەڕەوبن لەمــەدح کردندا) هەمووومان ئەوەمان دەوێت.

کەواتــە باپــەیڕەوی لەویاســا زێڕینــە بکــەین. بائــەوە بــدەین بەبەرانبــەرەکانمان کەخۆمان حــەزی پێدەکەین. ئەوە چۆن دەبێت؟ کەی دەبێــت؟ لــەکوێ دەبێــت؟ وەڵامەکــەش ئەمەیــە: هەمیشە، لەهەرکوێیــەك. بۆنمونــە: پرسیارم لەفەرمانبــەری پرسگەی(ڕادیۆسیتی)کرد، ژمارەی نوسینگەکەی (هنری سوفین) چەندە؟ . فەرمانبەرەکە لــەجل وبەرگدا زۆر پێکەوتــە و ڕێکوپێــك بــوو، شــانازی بەشــێوەی وەڵامدانــەوەی خۆیــەوە دەکــرد.. لەوەڵامــدا گــوتی: هنــری ســۆفین. (کــەمێك ڕاوەســتا)نهــۆمی هەژدە(کەمێك ڕاوەستا). ژووری ژمارە ١٨١٦.

بەپەلە بــەرە و(ئاسانسۆر)ەکە چووم... پاشان گەڕامــەوە بۆلای تاکو پێی بڵێم: دەمــەوێ پیرۆزبایی ئەو شێوازەجوانەت لێ بکــەم کەلــەوەڵامی پرســیارەکەدا بــەکارت هێنــا. زۆر ڕوون بویــت لەوەڵامدانــەوەدا. وەك هونەرمەندێ وەڵامت دایەوە. ئەوەش شتێکی ئاسایی نیە).

لەشادومانیدا گەشایەوە، پاشتر پێی گوتم کەبۆچی لەنێوان ڕستەیەك ویەکێکی تردا کەمێك ڕاوەستاوە وبۆچی هەموو ڕستەکانی بەوشێوەیە دەربڕی. ئەوقسەیەی من وای لێکرد بۆینباخەکەی ملیشی ڕێك بکات.پاش ئەوەی گەشتمە نهۆمی هەژدەیەم، هەستم دەکرد شادومانیەکی بێ سنورم بەخشیوەتە ئەوگەنجە.

نابێ چاوەڕوان بیت ببیتە باڵوێزی فەرەنسا یاخود سەرۆکی کۆمەڵەی کلامبایکسی یانەی ئیلك، ئەوجا فەلسەفەی ستایشی بەکار بێنیت.بەڵکو دەتوانیت وەکو جادویەك هەموو ڕۆژێك بەکاری بێنیت.

ئەگەر شاگردی چێشتخانە(بۆنمونە) لەبری پەتاتەی ی برژاو، پەتاتەی کوڵاوی بۆهێنـاین.بـابڵێین: بەداخـەوە نارەحـەت دەبیـت، ئێمە حـەزمان لەبرژاوە) ئەویش دەست بەجێ وەڵام ئەداتەوە (ناهەرگیز نارەحەت نابم) زۆریش خۆشحاڵ وشـادومان دەبێـت کـەدەبینێت تـۆ ڕێـزت لێگرتـووە. دەسـتەواژەگەلێکی وەکــو: (نیگــەرانم کەنارەحــەتت دەکــەم)، (دەفــەرمویت... .)، (بــەبێ زەحمــەت)، (ســوپاس)..ئـەم ڕسـتە و دەستەواژانە دەبنەهۆی ئەوەی بەئاسانی ئاشی ژیانی ڕۆژانە بگەڕێت... هەروەها بەڵگەشن لەسەر پەروەردەبوونێکی باش.

بانمونەیـەکی دیکـە وەربگـرین.ئایـا هیـچکام لەڕۆمانـەکانی(هـاڵ کاین)ت، خوێندۆتەوە؟ .

ملیۆنەها کەس ڕۆمانەکانیان خوێندۆتەوە.ملیۆنەهاکەس!!. ئەو کوڕی پیـاوێکی ئاسـنگەربوو.لەهەشـت سـاڵ زیـاتریش لەقوتابخانـە نـەی خوێندوە وزانستی وەرنەگرتووە. لەگەڵ ئەوەشداکاتێ مرد، یەکێك بوو لەهەرەدەوڵەمەنـدترین پیـاوانی جیهـان لەوڕێـژەدا.فـەرموو ئـەوە تـۆ و

ئەوەش بەسەرهاتی (هال کاین): هال کاین حەزی لەهۆنراوە وسرودی کورت بوو. هەموو هۆنراوەکانی (دانتی گبریال ڕۆزیتی)خوێندەوە. جارێکیان وتارێکی نوسی وتیایدا ستایشی دەستکەوتە هونەرییەکانی (ڕۆزیتی) کردبوو. ڕونوسێکی لەو وتارە نارد بۆ (ڕۆزیتی)... ڕۆزیتی بەو وتارە زۆرخۆشحاڵ بوو. ڕەنگە لەناخی خۆیداگوتبێتی: (هەرگەنجێ ئەو بۆچونە جوانەی بەرانبەر تواناکانی من هەبێ، هەردەبێ زیرەك وبیرتیژیش بێت).

بەو جۆرە ڕۆزیتی کوڕی ئاسنگەرەکەی بانگهێشت کردتاکو بێتە لەندەن ولەلای خۆی وەکوسکرتێر کاربکات. ئەم ڕووداوەش بویە خاڵی گۆڕانکاری لەژیانی (هال کاین)دا. چونکە لەوشوێنە تازەیەدا چاوی دەکەوت بەوێژەوانەکانی سەردەمی خۆی. سودی لەهاندان وئامۆژگارییەکانی ئەوان دەبینی. بەو جۆرەش بەڕێرەوێکی ژیاندا ڕۆشت کەبویە هۆی ئەوەی ناوی بەئاسۆکانی ئاسماندا بڵاوبێتەوە. هەروەها ماڵەکەیشی(قەڵای گریبا)، لە(دورگەکانی مرۆڤ)دا، بویە مەزارێك وخەڵکی لەهەموولایەکی جیهانەوە ڕویان تێدەکرد... لەپاش خۆیشی هێندەی ماڵ وموڵك بەجێ هێلا کەبە دوو ملیۆن وپێنج سەد هەزار دۆلار مەزەندە دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا. کێ دەزانێ-ڕەنگە بەهەژاری ونەناسراوی بمردایە، ئەگەر ئەو نامەیەی بۆ ئەو پیاوە ناودارە نەنوسیایە. ئەوەیە هێز، هێزی هەرەگەورەی ستایشی ڕاستگۆیانە ودڵسۆزانە. (ڕۆزیتی) خۆی بەگرنگ دەزانی. ئەمەش شتێکی نامۆنیە. چونکە هەموو مرۆڤێك خۆی زۆر بەگرنگ دەزانێت.

ئایا پێت وایە تۆپلەوپایەت لەژاپۆنیەکان بەرزترە؟ لەڕاستیدا، ژاپۆنیەکان زۆر خۆیان لەتۆ بەرزتر دەبینن... ئەوان دەخرۆشێن وتەواو تووڕە دەبن ئەگەر ببینن پیاوێکی سپی پێست لەگەڵ خانمێکی ژاپۆنیدا دانس دەکات. ئایا پێت وایە پلەو پایەت لەهندۆسەکان بەرزترە؟ ئەمە یەکێکە لەباشیەکانت، بەڵام ملیۆنێك هندۆسی پێیان وایە پلەو پایەیان لەتۆ بەرزترە. تەنانەت ئەوان خۆراکێك ناخۆن کەسێبەری تۆی کەوتبێتەسەر.

ئایا هەستت وایە، لەئەسکیمۆ باشتریت؟ جارێکی تریش، ئەوە شتێکی باشە.وەلێ ئایا ناتەوێت بزانیت ئەسکیمۆ گومانی بەرانبەرت چۆنە؟ لەنێو ئەسکیمۆدا کەسانێك هەن. نەکاردەکەن ونە ئەیانەوێت هیچ جۆرە سودێکیش بگەیەنن.ئەسکیمۆ ناوی ناون(پیاوەسپییەکان).

هەرگەلێك بگریت، خۆی بەباشتر دەزانێت لەگەلانی تر.ئەم هەستەش دڵگەرمی وجەنگەکانی پێوەیە.لەڕاستیشدا هەموو مرۆڤێك بەشێوەیەك لەشێوەکان خۆی لەکەسانی تر بەباشتردەزانێت.بۆیە باشترین ڕێگەش بۆ ئەوەی بتوانیت بچیتە ناو دڵیەوە، ئەوەیە وای لێ بکەیت هەست بکات بەوەی تۆ ڕێزی ئەو بایەخەی ئەو دەگریت لەنێو جیهانە بچکۆلەکەیدا.

ئەو گوتەی ئەمرسۆنت لەبیربێت کەدەڵێت: (چاوم بەهەرپیاوێ بکەوێ پێم وایە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەمن باشترە، لێرەوە، ئیدی دەتوانم لێیەوە فێرببم).

لایەنی خەفەتنامێزی ئەمەش، ئەوەیە ئەوانەی پاساوی هەڵوێستەکانی خۆیان ئەدەن، هەستەناوەکیە تێکچووەکانیان، بەهات وهاوار وتێکچوونی‌دەروونی وغرور دەتەقێننەوە، کەلەڕاستیشدا ئەمە

شتێکی بێزارکەرە،وەك شکسپیر دەڵێت: (مرۆڤ، مرۆڤی مەغرور!زانیاریەکی سادەی هەیە، کەچی فێڵی سەیرلەبەردەم ئاسماندا دەکات، ئەمەش فریشتەکان دەگریەنێت).

سێ چیرۆك وبەسەرهاتتان پێشکەش دەکەم، سەبارەت بەسێ بژنسمان کەئەو یاسایانەیان پەیڕەو کرد وئەنجامی باشیان لێ وەدەست هێنا.یەکەمجار ئەم حاڵەتە وەردەگرین کەخاوەنەکەی بەهۆی کەسە نزیکەکانیەوە حەزناکات ناوی بەرین.

پاش ئەوەی پەیوەندی بەپەیمانگاکەمەوە کرد، بەڕێز( پ) لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەرە و(لۆنگ ئایسلەند) ڕۆشتن، بۆسەردان و دیدەنی هەندێ لەخزم وکەس وکارەکانی هاوسەرەکەی .لەوێ هاوسەرەکەی ڕۆشت بۆ سەردانی خزمەگەنجەکانی و مێردەکەی بەجێ هێڵا تاکو لەگەڵ پورە پیرەکەیدا بمێنێتەوە.بەڵام ئەبێ باسی چی لەگەڵدا بکات؟ باسی جێبەجێ کردنی بنەماکانی ستایش.بیری لەوە کردەوە لەگەڵ ئەوپیرەژنەدا دەست بەجێ کردنی بنەماکان بکات.

بەدەوری خانوەکەدا سوڕایەوە تاکو بزانێ چ شتێکی تێدایە کەجێگەی ستایش کردنی دڵسۆزانە وڕاست گۆیانە بێت.لەئەنجامدا لەپیرەژنەکەی پرسی:

ئەم خانوە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠ دروستکراوە، وانیە؟

- بەڵێ، کتومت لەوساڵەدا دروستکراوە.

ئەوخانوەم وەبیر دێنێتەوە کەتیایدا لەدایك بوم.خانویەکی جوانە.ژورەکانی فراوانن. لەم ڕۆژگارەدا. خانوەکان بەوشێوازە دروست ناکرێن.

تۆڕاست دەکەیت). پیرەژنەکە ڕەزامەندی بۆ دەربڕی. (گەنجەکانی ئەمڕۆ بایەخ بەخانوی جوان نادەن. تەنها گرنگی بەوە ئەدەن خانویەکی بچکۆلە وبەفرگرەیەکیان هەبێت و، بەئۆتۆمبیلەکانیان بگەڕێن).

ئەم خانوە، خانوی خەونەکانە) پیرەژنەکە ئەم قسەیەی بەدەنگێکی پڕلەسۆزەوە کرد. ئەم خانوە بەخۆشەویستی دروستکرا. من ومێردەکەم چەندساڵێ بەر لەدروست کردنی خەونمان پێوە دەبینی. ئەندازیارمان بۆ بانگ نەکرد. خۆمان نەخشەمان بۆ دانا.

دوای ئەوە بەخانوەکەدا گەڕاندی. ڕێزی لەو شتەئەنتیکە جوانانە ئەگرت کە ئەو ژنە لەکاتی سەفەرەکانیدا کۆی کردبونەوە: تاقمی قوری وپیاڵەی ئینگلیزی، دەوری سینی، کورسی فەرەنسی، پارچەقوماشی ئاوریشم کەکاتی خۆی لەنمایشگایەکی فەرەنسیدا پیشان درابوون. بەڕێز(پ) گوتی: (لەپاش ئەوەی خانوەکەی بەتەواوی پێ نیشاندام، بردمی بۆ ژێر زەمینێك لەوێش ئۆتۆمبیلێکی جۆی (پاکارد)ی نیشاندام کەئەمیان تاڕادەیەك تازەبوو.

دواتر بەدەنگێکی ناسك گوتی: مێردەکەم ماوەیەکی کەم بەرلەوەی بمرێت، ئەم ئۆتۆمبیلەی کڕی. لەوەتەی ئەو مردوە سواری ئەم ئۆتۆمبیلە نەبووم... تۆڕێزی شتەبەنرخەکان دەگرێت. لەبەرئەوە ئەم ئۆتۆمبیلەت پێشکەش دەکەم.

*(پورێ گیان! تۆ من شەرمەزار دەکەیت. من ڕێزلە بەخشندەیت دەگرم. بەڵام ناتوانم ئەو دیاریە وەرگرم. من خزمی نزیکی تۆنیم. ئۆتۆمبیلێکی تازەیشم هەیە. خۆیشت خزمی نزیکت زۆرە، ئەوان حەزدەکەن ئەو ئۆتۆمبیلەیان پێ بدەیت.

-(خزم!) بەسەرسوڕمانەوە پیرەژنەکە گوتی(خزم!). بەڵێ خزمم زۆرە کەچاوەڕوان دەکەن بمرم وئۆتۆمبیلەکە بۆخۆیان ببەن. بەڵام ئەو ئۆتۆمبیلەیان دەست ناکەوێ).

* ئەگەر نەتەوێ بیدەیت بەخزمەکانت، زۆربەئاسانی دەتوانی بیفرۆشیت.

- بەڕومدا هەڵشاخا: (بیفرۆشم!). ئایا پێت وایە دەتوانم بیفرۆشم؟ ئایا پێت وایە چاوم بەرایی ئەدا غەوارەیەك ببینم ئەو ئۆتۆمبیلە بەسەر شەقامدا لێ بخوڕێت؟ هەرگیز بیر لەفرۆشتنی ناکەمەوە.بەدیاری دەیدەم بەتۆ. چونکە تۆ ڕێز لەشتە بەنرخەکان دەگریت!).

هەوڵیدا خۆی بدزێتەوە لەوەرگرتنی ئۆتۆمبیلەکە، بەڵام نەیدەتوانی بەبێ بریندارکردنی هەستی پیرەژنەکە ئەو کارەبکات.

ئەو پیرەژنەی کەبەتەنها لەگەڵ پارچە دانسقە فەرەنسیەکان ویادەوەریەکانیدا بەجێ مابوو، زۆریش تامەزرۆی کەمێك سوپاس و ستایش کردن بوو. ڕۆژگارێك ئەمیش، کچێکی جوان و سەرنج ڕاکێش بووە وگەنجەکان هەوڵیان بۆداوە.ئەو خانوەیشی بۆیە دروستکرد، تاکو پڕی بکات لەخۆشەویستی.لەهەموو لایەکی ئەورووپاوە شتی جوان ودانسقەی بۆ ڕازاندنەوەی خانوەکەی کۆکردەوە.ئێستاش، لەنێو نامۆیی پیریتی‌دا، پێویستی بەکەمێك گەرموگوڕی مرۆیی وڕێزگرتنی ڕاستگۆیانەیە-بەڵام هیچ کەسێك نەبوو ئەو کەمە ڕێزەی پێ ببەخشێت.بۆیە هەر کەئەوکەسەی دەست کەوت، وەك مرۆڤی چاوگێك ناوی سازگار لەبیابانێکدا بدۆزێتەوە، هیچ ڕێگەیەکی تری شك نەدەبرد

بۆئەوەی دان بەجوانیەکانی ئەو کەسەدا بنێت، بێجگە لەوەی ئۆتۆمبیلە(باکارد)ەکەی پێ ببەخشێت.

باچیرۆکێکی تر وەرگرین، ئەمجارەیان لەبارەی(دۆناڵدم.ماک ماهون)ەوە، ئەم پیاوە بەڵێندەرە بوو لەکۆمپانیای (لویس وفالنتین) بۆ کارو باری ئەندازیاری لە(ڕای)ی ویلایەتی نیویۆرک:

خۆی دەڵێت: پاش ئەوەی گوێبیستی باس وخواسێك بووم سەبارەت بە(چۆن هاوڕێ پەیدادەکەیت وکاریگەری لەسەر خەڵك دادەنێیت، دیزاینی خانوم دەکرد بۆ دادوەرێکی بەناوبانگ.خاوەنی خانوەکە هەندێ پێشنیاری پێشکەش کرد دەربارەی ئەوگوڵانەی کەدەیەوێت لەخانوەکەیدا بیان ڕوێنێت، پێم گوت:

(جەنابی دادوەر، تۆ هیوایەتێکی جوانت هەیە. من زۆر سەرسامم بەسەگەکانت، دەشزانم لەنمایشگای سەگەکاندا، کە هەموو ساڵێك لەمادیسۆن سکویرگاردن سازدەکرێ، شریتی شین بەدەست دێنێت).

کاریگەری ئەم ستایشەجێگەی سەرسوڕمان بوو.

(بەڵێ) دادوەرەکە وەڵامی دایەوە: (زۆر بایەخ بەسەگ دەدەم. حەزناکەیت سەگە بچوکۆلەکانم ببینیت؟ ).

نزیکەی یەك کاتژمێر سەگەکانی وئەو خەڵاتانەیشی نیشاندام کەبەدەستی هێنابوون، تەنانەت سەگەبچکۆلەکانیشی دەهێنایە دەرەوە وئەو دەمارە خوێنانەیانی نیشان دەدام کە دەبنە بەڵگەلەسەر جوانی ڕەزیرەکی سەگەکانی.

دواتر ئاوڕی دایەوە بەلامدا وپرسیاری کرد: (منداڵی بچکۆلەت هەیە؟ ).

-بەڵێ.

* زۆرباشە، حەزی لەسەگی بچوک هەیە؟ .

-ئەریّ وەڵلا، زۆر حەزی لێیە.

* زۆرباشە من دانەیەك لەوسەگانەی بەدیاری ئەدەمێ.

دواتر باسی ئەوەی بۆکردم کەچۆن چۆنی خۆراك بەسەگە بچوکە بدەم.هێندەی نەبرد، ڕاوەستا وگوتی: (بەدڵنیاییەوە، ئەوەت لەبیر دەچێت.باشێوازی خۆراك پێدانەکەت بۆ بنوسمەوە).جەنابی دادوەر، ڕۆشتە ماڵەوە وچۆنێتی خۆراك پێدانی سەگەکەی بۆ نوسیم.پاشان سەگەکەیشی پێدام کەنرخەکەی دەگەشتە سەد دۆلار، جگەلەوە سەعاتێك وپەنجا خولەك لەکاتە بە نرخەکەی خۆیشی پێدام.هەموو ئەوانەی پێدام، تەنها لەبەرئەوەی من سەرسامی ڕاستگۆیانەی خۆم دەربڕیبوو بە هیوایەتەکانی ئەو.

(جۆرج ئیستمان) داهێنەری فیلمە تەنکەکان، بڕی سەدملیۆن دۆلار ماڵ وسامانی کۆکردەوە... خۆیشی کردە گەورەترین بزنسمان لەجیهاندا، سەرباری دەستکەوتە مەزنەکانی، کەچی وەکو من وتۆ حەزی بەستایش کردن دەکرد.

بۆنمونە، چەندساڵێك لەمەوبەر، ئیستمان سەرقاڵی دروستکردنی قوتابخانەی ئیستمانی مۆسیقی وهۆڵی کیلبۆرن بوو لەڕۆجستەر، هۆڵی شانۆکەی بۆ بەرز ڕاگرتنی یادی دایکی دروست دەکرد.(جیمس ئادامسۆن) سەرۆکی کۆمپانیای تەجهیزکردنی ئۆتێلەکان لەنیویۆرك، هەوڵی ئەدا تەندەری تەجهیزکردنی ئەو ئاپارتمانانە بەدەست

بێنێت.پاش ئەوەی پەیوەندی بەئەندازیارەکەوە کرد.ئادەمسۆن وادەیەکی دان بۆبینینی بەڕێز ئیستمان لەڕۆجستەر.

کاتێ ئادامسۆن گەیشت، ئەندازیارەکە گوتی: دەزانم تۆ دەتەوێت ئەندەرەکانت دەست بکەوێت، بەڵام هەر لەئێستەوە دەمەوێت پێت بڵێم کەتۆ ناتوانیت پێنج خولەك زیاتر لەکاتی ئیستمان بۆ خۆت بەریت.ئەو زۆر سەرقاڵە.هەربەپەلە مەبەستەکەتی بۆ ڕوون بکەرەوە وبێرە دەرەوە.ئادامسۆن خۆی ئامادەکرد وابکات کەئەندازیارەکە دەڵێت.کاتێ ڕێگەیاندا بچێتە ژوورەوە، سەیری کرد بەڕێز ئیستمان سەرقاڵی دونیایەك کاغەزو نوسراوە.بۆیە هەرکە بەڕێز ئیستمان تەماشای کرد و چاویلکەکەی لابرد، بەرە و ئەندازیارەکە وئادامسۆن ڕۆشت وگوتی: بەڕێزان بەیانیتان باش، دەتوانم چ کارێکتان بۆبکەم؟ ).

ئەندازیارەکە بەڕێز ئادامسۆنی بەئیستمان ناساند، ئینجا گوتی: کەچاوەڕوانم دەکردی، چاودێری نوسینگەکەتم دەکرد. من ئەگەر ژورێکی وەکو ئەمەی تۆم هەبوایە، بایەخم بەکارەکەم نەئەدا.تۆدەزانیت من ئەندازیاری دیکۆرم.لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا لەژیانمدا نوسینگەی جوانی وەك ئەمەی تۆم نەدیووە.

جۆرج ئیستمان لەوەڵامدا دەڵێت: تۆ شتێکت وەبیر هێنامەوە کەخەریك بوو لەبیرم دەچوویەوە.جوانە، وانیە؟ لەسەرەتاوە سەرسامی کردم.بەڵام ئێستا ئەوەندە سەرقاڵی کارم، جاری واهەیە بۆماوەی چەند هەفتەیەك ئەم نوسینگەیە نابینم، ئادەمسۆن بەژوورەکەدا گەڕاو ئینجا دەستی هێنابەسەر ڕەفەیەکدا وگوتی: ئەمە بەڕوی ئینگلیزیە، وانیە؟ کەمێك جیاوازە لە بەڕوی ئیتاڵی).

(بەڵێ) ئیستمان وەڵامی دایەوە.(بەڕوی ئیگلیزیی وئاوەردەکراوە.برادەرێکم کەدارشوناسێکی پسپۆڕە بۆی هەڵبژاردم).

پاشان ئیستمان هەموو ژورەکەی پیشاندا، ئاماژەی دەکرد بۆبەش جۆربەجۆرەکان ورەنگ وچاڵە دەستیەکان وهەموو ئەو شتانەی ترکە لەپلان دانان وجێبەجێ کردنی دیکۆری ژورەکەدا یارمەتی دەربوون.

لەکاتی گەڕان بەژورەکەدا وسەیر کردنی کەلوپەلی دارینەکانیدا.لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستان، ئیستمان بەشێوازێکی خۆبەکەم زانانەوە، ئاماژەی کرد بۆهەندێ لەو دامەزراوانەی کەدەیەوێت.لەڕێگەیانەوە هاوکاری مرۆڤایەتی بکات: زانکۆی ڕۆجستەر ونەخۆشخانەی گشتی، نەخۆشخانەی چارەسەرکردن، خانەی هاوڕێیەتی، نەخۆشخانەی منداڵان... ئادەمسۆن زۆر بەگەرمی دەستخۆشانەی لێکرد لەبەرانبەر ئەو شێوازە نمونەییەدا کەماڵ وسامانەکەی تیچدا بەکار دەهێنێت ودەیخاتە خزمەتی سوککردنی ئاسۆرەکانی مرۆڤایەتیەوە... لەپاشدا، جۆرج ئیستمان گەنجینەیەکی شوشەی کردەوە و، یەکەم کامێرای بەدەستەوە گرت کەکاتی خۆی داهێنراوی کابرایەکی ئینگلیزبوو کڕیبووی.

ئادەمسۆن پرسیاری هەوڵەپێشوەختەکانی لێکرد بۆکارکردن. بەڕێزئیستمانیش زۆر بەڕاستگۆیانە باسی سەردەمی هەژاری ومنداڵێتی خۆیی بۆکرد، باسی دایکەبێوەژنەکەیی بۆکرد، کەئاوەندێکی ساوایانی کردبویەوە، ئەمیش خۆی وەك نوسەر لەکۆمپانیایەکی تەئمیندا کاری دەکرد ڕۆژی بەپەنجاسەنت. دیوەزمەی هەژاری بەڕۆژ وبەشەو باڵی

کێشابووبەسەریدا.کەچی بڕیاریدا پارەو پوڵی تەواو کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی دایکی دەست هەڵگرێت لەوکارە سەختەی کەدەیکرد.

بەڕێز ئادەمسۆن پەلکێشی کرد بۆباس وخواسی زیاتر.دانیشت وبەپەرۆشەوە گوێی بۆقسەکانی دەگرت لەکاتێکدا ئەو باسی لەئەزمونی خۆی لەهونەری وێنەگرتندا دەکرد.باسی ئەوەی بۆدەکرد چۆن بەدرێژایی ڕۆژ لەنوسینگەکەیدا کاری دەکرد.تەنانەت هەندێ جار بەشەوی‌شداتاقی کردنەوەکانی ئەنجام ئەدا، جاربەجارێك تاکو مادەکیمیاویەکان کارلێکیان لەیەك دەکرد.ئەم خەوە نوچکەیەکی دەدا.

جیمس ئادەمسۆن، کاتژمێر دەوپانزدە خولەك چویە نوسینگەکەوە، لەسەرەتاوە هۆشدارییان دابویە کەتەنها پێنج خولەك مافی مانەوەی هەیە لەژوورەوە، کەچی کاتژمێرێ تێ پەڕی، ئینجا بوو بەدوو کاتژمێر، ئەوان هێشتر لەگەرمەی قسەکردندابوون!!.

دواجار، ئیستمان ئاوڕی دایەوە بەلای ئادەمسۆندا وگوتی: (کۆتاجار کەلەژاپۆن بووم، هەندێ کورسیم کڕی وهێنامنەوە بۆماڵەوە ولەحەوشەکەدا دامنان.بەڵام خۆر ڕەنگەکەیانی بردبوو... ناچار خۆم چووم لەبازاڕ بۆیاخم کڕی وهەرخۆیشم ڕەنگم کردنەوە.حەزئەکەیت ئەوکارە ببینیت کەکردومە؟ زۆرباشە، فەرموو ئەچینەوە بۆماڵەوە، ئێوارە لەماڵی ئێمە نان دەخۆین وکورسیەکانیش دەبینیت).

لەپاش شێوکردنەوە، بەڕێز ئیستمان ئەو کورسیانەی پیشانی ئادامسۆن دا کەلەژاپۆن کڕیبونی.نرخی هەریەك لەو کورسیانە لەیەك دۆلار ونیو تێنەدەپەڕی.بەڵام ئەو جۆرج ئیستمانەی کەسەد ملیۆن

دۆلاری بەکارکردن، کۆکردبویەوە، زۆرشانازی بەو کورسیانەوە دەکرد، چونکە خۆی بۆیاخی کردبوون!!.

نرخی کەلوپەلەکان لەوبینایانەدا گەشتە(٩٠/٠٠٠)هەزار دۆلار.گومانت وایە کێ تەندەری کڕینەکەیانی بۆدەرچوو؟ ئادەمسۆن یان یەکێك لەڕکابەرەکانی؟ . لەوکاتەوە، تاکوبەڕێز ئیستمان کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ جیمس ئادەمسۆندا بوونە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی.

پێویستە لەکوێوە دەست بەستایش کردن بکەین؟ بۆچی هەرئێستا لەماڵەوە دەست پێ نەکەین؟ من نازانم لەچ جێگەیەکەوە گرنگە دەست پێ بکەین... پێویستە لەهاوسەرەکەتدا هەندێ تایبەتمەندی وخەسڵەتی باش هەبێت، ئەگەر بیرلەجێ بەجێ کردنی ستایشکردن بکەیتەوە- ئەگەر وانەبوایە نەتدەکردە هاوسەری خۆت.بەڵام لەکەیەوە تۆ سەرسامی خۆت دەربڕیوە بە سەرنج ڕاکێشی ژنەکەت؟ لەکەیەوە؟ .

چەندساڵێك لەمەوبەر ڕۆشتم بۆ ڕاوەماسی لەسەرچاوەکانی (میرامینشی) لە(نیوبرانسویك)دا.لەنێو خێوەتگایەکی دابڕاودا بووم لەقوڵاییەکانی دارستانە کەندیەکاندا. تاکەشتێك کەبۆ خوێندنەوە دەستم کەوت، ڕۆژنامەیەکی ناوخۆیی‌بوو: هەرچی شتێ لەو ڕۆژنامەدا بوو خوێندمەوە. بەڕیکلامەکانیشەوە.بەو وتارەشەوە کەبەپێنوسی(دورۆتی دیکس) نوسرابوو.وتارەکە زۆرجوان وقەشەنگ بوو، بەجۆرێ قرتاندم ولای خۆم پاراستم وهەڵمگرت... نوسەر لەووتارەدا باسی ئەوە دەکات کەتەواو لەوئامۆژگاریانە بێزاربووە کەپێشکەشی بوك وزاواکان دەکرێن.بەڵکو(بەڕای ئەو) پێویستە یەکێك هەستێ زاواکە بخاتە لایەکەوە وئەم ئامۆژگاریەی بکات: مەدح وستایش کردنی ژن، بەر لە هاوسەرگیری

نارەزوویەکە بۆژنەکە. بەڵام لەدوای هاوسەرگیری زەرورەت وتەنانەت ئەمانەتێکی شەخسیشە... هاوسەرگیری جێگەی دوژمنایەتی نیە.بەڵکو کێڵگەی دبلۆماسیەتە.

ئەگەر حەزت لەوەیە ژیانێکی خۆشت هەبێت، ڕەخنەلەکار وفرمانەکانی ژنەکەت مەگرە، یاخود بەراوردی کارەکانی مەکە بەئیشەکانی دایکت!! بەپێچەوانەوە، بەردەوام دەستگوشاد بەلەستایشکردنیدا وبەئاشکرا باسی ئەوەبکە کەزۆر شادومانیت بەوەی ژنێکت هێناوە تایبەتمەندیەکانی (ڤینۆس ومینرفا وماری ئان)ی تێدا کۆبۆتەوە.تەنانەت ئەگەر خۆراك ونانیشی زۆرخراپ ئامادەکردبوو، توڕەمەبە.بەڵکو بڵێ، ئەم ژەمە زۆرباش بوو، لەباشیدا ئاستێکی ئاسایی نەبوو!!(دەربڕینی وەرگێڕ).بەوەش هانی ئەدەیت زیاتر گرنگی بەئامادەکردنی چێشت وژەمەکان بدات، تاکو بگاتە ئاستی گومانی باشیی تۆ.

لەناکاو دەست بەوکارە مەکە- چونکە گومانی بۆپەیدا دەکات.بەڵکو ئەم شەو، یان سبەی شەو، چەپکێ گوڵ یان پاکەتێ شیرینی بۆبێنە... هەربەقسە مەڵێ(بەڵێ، پێویستە وابکەم)!بەڵکو بەڕاستی وابکە.زەردەخەنەیەکی بۆبکە. وهەندێ قسەی گەرم وگوڕی بەگوێدا بدە.ئەگەر هەموو ژن ومێردەکان وابکەن، ئەرێ هیچ پەیوەندیەکی هاوسەرگیری شکست دێنێت وهەڵدەوەشێتەوە؟

حەزدەکەیت بزانیت، بەچ شێوەیەك ژنێك دەکەوێتە نێو داوی خۆشەویستی تۆوە؟ زۆرباشە.بفەرموو نهێنیەکت پێ بڵێم.بەڵام بیرۆکەکەی بیرۆکەی من نیە.بەڵکو لە(دورۆتی دیکس)م وەرگرتوە.جارێك

چاو پێکەوتنی لەگەڵ ئەو پیاوەدا سازکرد کەفرەژن بوو، توانیبوی دڵی بیست وسێ ژن ڕام بکات(شیاوی باسە بڵێین لەزیندانەدا ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا سازکردبوو) باسی ئەوەی لێپرسی کەئایا چ شێوازێك پێڕە دەکات کاتێ واڵەژنێك دەکات بکەوێتە داوی خۆشەویستیەوە.لەوەڵامدا کابرا گوتی: هەرگیز پەنا نابەمەبەر فێڵ وچاوبەست: تەنها ئەوەی لەسەرتۆیە، ئەوەیە کاتێ لەگەڵ ژنێکدا دووایت، باسی خۆیی بۆبکە.

هەمان شێواز لەگەڵ پیاوانیشدا بەسودە: (باسی خۆی بۆپیاویش بکە) دزرائیلی، یەکێکە لەزیرەکترین ئەو پیاوانەی حوکمی شانشینی بەریتانیایان کردووە، دەڵێت: (باسی خۆی بۆ هەرپیاوێ بکەیت، چەندین کاتژمێر گوێت بۆدەگرێت).

بەو جۆرەش، ئەگەر ئەتەوێت خەڵك خۆشیان بوێیت، ئەم ڕێسایە بەکار بێنە: وابکە کەسی بەرانبەرت هەست بەبایەخی خۆی بکات... بەڕاستگۆیی ئەو کارەبکە.ماوەیەکی زۆرە سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم پەرتوکەیت. پەرتوکەکە دابخە ودەست بکە بەجێبەجێکردنی فەلسەفەی ستایش کردن. لەگەڵ ئەوکەسەی لەنزیکتەوە دانیشتوە... پاشان سەرنجی ئەو ئاسەوارە جادوییە بدە، کە ئەم ستایش کردنە لەسەر ئەوکەسەی بەجێ دەهێڵێت.

# دەروازەی سێیەم

هەندێ ڕێگە بۆڕاکێشانی خەڵك بەرەو شێوازی بیرکردنەوەی خۆت

دیل کارنگی دەڵێت:

زۆربەی خەڵك، ئەو توانا زیرەکانەیان نیە کەدەست لەدەستی ئەویتر بنێن بۆ چوونەنێوقەڵای بیروباوەڕە مرۆییەکانەوە... لەنێو توانای زیرەکانەدا، نهێنی فێربوونی ئەم ڕێگەیە هەیە: (چۆن دڵی کەسانی تر ڕادەکێشیت بەرەو شێوازی بیرکردنەوەی خۆت و، دواتر هاوکاری دڵگەرمانەیان لێوە بەدەست دێنیت).

# بەشی سیازدەیەم

## ڕێگەیەکی مسۆگەر بۆ پەیداکردنی ناحەز، وە چۆنیش خۆت لەو ڕێگەیە دوور دەخەیتەوە؟

ئەوەدەمەی تیۆدۆر ڕۆزڤلت لەکۆشکی سپیدابوو، دانی بەوەدا نا ئەگەر بتوانێ ٧٥٪ ڕاستی بپێکێت، ئەوا ئەو پەڕی هیوایەتەکانی بەدەست هێناوە.

ئەگەر ئەو ڕێژەیە، ئەو پەڕی هیوایەتەکانی درەوشاوەترین پیاوی سەدەی بیستەم بێت، ئەی ئەبێ من وتۆ چۆن بین؟!.

ئەگەر دڵنیایت لەوەی دەتوانیت ٥٥٪ لەسەرهەق بیت، ئەوا بۆت هەیە بچیتە وۆڵ ستریت ورۆژانە یەك ملیۆن دۆلار بەدەست بێنیت ویەختێ بکڕیت وژنێکی جوانیش بێنیت.ئەگەر دڵنیاش نیت لەوەی دەتوانیت ٥٥٪ هەق بپێکیت، کەواتە بۆچی بەخەڵکی دەڵێیت لەسەرهەڵەن؟!.

دەتوانیت لەڕێی جوڵەیەك یان نیگایەك یان دەنگێکەوە بەکەسێك ڕابگەیەنیت کەلەسەر هەڵەیە، دروست وەك چۆن دەتوانیت لەڕێی چەند وشەیەکەوە ئەوەی پێ ڕابگەیەنیت-بەڵام ئەگەر پێشی ڕابگەیەنیت کەلەسەر هەڵەیە.چۆن دەتەوێت ئەو بێتە سەر ڕایەکەی تۆ؟ هەرگیز

نایەتە سەر ڕایەکەی تۆ!چونکە تۆ گوڕزێکی ڕاستەو خۆت داوە لەزیرەکی ودانایی وغروروپشت بەخۆ بەستنی ئەو. ئەمەش وای لێ دەکات گورزەکە ئاراستەی خۆت بکاتەوە، هەوڵ ئەدات لەڕاکانیدا ڕەق وسەخت گیر بێت. ئیدی تۆ پەناش بەریتە بەر لۆژیکەکەی (ئەفلاتون) یان فەلسەفەکەی (ئیمانوئیل کانت). ناتوانیت گۆڕان بەسەر بۆچونەکانی ئەو کەسەدا بهێنیت، چونکە هەستەکانیت برینداز کردووە.

هەرگیز بەم دەستەواژەیە دەست بەقسە مەکە(بۆت دەسەلمێنم کەوا، وا) ئەم شێوازە خراپە، چونکە وەك ئەوە وایە بڵێیت: من لەتۆزیرەك ترم، لەبەرئەوە شتێکت پێ دەڵێم کەڕاوبۆچونت بگۆڕێت).

ئەمە گرەوکردنە، دژایەتی کردنە وهانی کەسی بەرانبەرت ئەدا تاکو تەنانەت بەرلەوەی دەست بەقسەکردنیش بکەیت ئەو دژایەتیت بکات.دیارە لەبارودۆخە ئاساییەکانیشدا زۆرسەختە. بتوانین ڕاو بۆچونی کەسانی تر بگۆڕین. کەواتە بۆچی مەسەلەکان ئاڵۆزبکەین؟ بۆچی پەکی خۆمان بخەین؟ ئەگەر ویستت شتێك بسەلمێنیت مەهێڵەکەسانی تر بەو نیازەت بزانن. .بەڵکو تەواو بەزیرەکانە وبێدەنگی ئەو کارەبکە، بەشێوەیەك هیچ کەسێك پێت نەزانێت.(پێویستە خەڵکی بەشێوازێك فێربکەیت وەك ئەوەی فێرت نەکردبن.شتە نادیارەکانیشیان بۆ پێشنیار بکرێت وەك ئەوەی شتانێکی لەبیرکراوبن نەك نادیار)... وەك (ئەگەر توانیت، لەخەڵك داناتربە.بەڵام باخەڵك بەوە نەزانن!).

ئێستا زۆرکەم بڕوادەکەم بەو شتانەی کەبیست ساڵ لەمەوبەر بڕوام پێیان هەبووە-جگەلەخشتەی لێکدان... گومان دەکەم لەزانیاریەکانم تەنانەت کاتێ لەبارەی ئەنیشتاینیشەوە دەخوێنمەوە.بیست ساڵی

تریش دوای ئێستا، لەوانەیە بڕوام بەوشتانە نەبێت کەلەم پەرتوکەدا باسم کردوون. بەکورتی زۆر دڵنیام لەوشتانەی کەپێشتر لێیان دڵنیابووم. سوکرات بەشوێنکەوتوەکانی خۆی گوت لەئەسینادا: (تاقە شتێ من دەیزانم، ئەوەیە کەهیچ نازانم).

زۆرباشە، من نامەوێت لەسوکرات زیرەکتربم، لەبەرئەوە دوورکەوتومەتەوە لەوەی بەخەڵك بڵێم ئێوە لەسەر هەڵەن... هەستیشم کردووە ئەم دوورکەوتنەوەیەم سودی هەبووە.

ئەگەر مرۆڤێك قسەیەکی هەڵەی کرد-تۆش باش دەتزانی هەڵەیە- ئایاواباشترنیە، بەم شێوەیە وەڵام بدەیتەوە وبڵێیت: (زۆرباشە، ئێستا سەرنج بدە، من بیرۆکەیەکم هەیە، لەوانەیە هەڵەش بم... مادەم وایە ئەگەر هەڵەش بم. دەمەوێت هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە. کەواتە باسەرنج لەڕاستیەکان بدەین).

(ئەمە جادووە، جادویەکی پۆزەتیڤە کەلەناوا دەربڕینێکدا مۆڵ دەخوات:

(لەوانەیە هەڵەش بم. مادەم وایە، ئەگەر هەڵەش بم. دەمەوێت هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە).

لەئاسمان وسەرزەوی وتەنانەت لەناو ئاوی ژێرزەویەکانیشدا کەسێك نیە ڕێگری قسەیەکی ئاوات لێ بکات: (لەوانەیە هەڵەبم، باسەرنجی ڕاستیەکان بدەین).

زاناکان وادەکەن. جارێکیان چاوپێکەوتنێکم سازدا لەگەڵ دۆزەرەوە وزانای بەناوبانگ(ستیڤانسۆن)دائەنجامدا کەیازدەسالی ڕەبەق لەجەمسەری باکوری گۆی زەوی مابویەوە وماوەی شەش ساڵ تەنهابە

خواردنی گۆشت وناو ژیابوو.ئەو زانایە باسی ئەزموونێکی بۆ کردم کەخۆی پێی هەستابوو.پرسیاری ئەوەم لێکرد کەبەچ شتێ هەوڵی سەلماندنی ئەزموونەکەی ئەدا.هەرگیز وەڵامەکەیم لەبیرناچێ... لەوەڵامدا گوتی: (زانا، هەوڵ نادات هیچ شتێ بسەلمێنێ.بەڵکو هەوڵ ئەدات ڕاستیەکان بدۆزێتەوە).

تۆدەتەوێت لەبیرکردنەوەتدا کردەیی بیت، وانیە؟ . زۆر باشە.هیچ کەس ڕاتناوەستێنێ جگەلەخۆت.هەرگیز ناشکەویتە هەڵەوە ئەگەر دان بەوەدا بنێیت کەبەهەڵەدا چویت.چونکە ئەو دان پێدانانە هەموو دەمبەدمەکان ڕادەوەستێنێت و، دەبێتە نیگابەخش بۆبەرانبەرەکەت تاکو ئەویش وەکو تۆ نەرم ونیان وسنگ فراوان بێت.جگە لەوە ئەویش هاندەدات دان بەوەدا بنێت کەڕەنگە ئەویش لەسەر هەڵەبێت. ئەگەر زانیت بەرانبەرەکەت هەڵەیە، بەڵام بەزمانێکی ڕەق ئەوەت پێ ڕاگەیاند، دوای ئەوە چی ڕوئەدات؟ لێم گەڕێ بایەك نمونەت لەو ڕووەوە پێشکەش بکەم.

بەڕێز(س) پارێزەرێکی لاو بوو لەنیویۆرك، بەم دواییانە موناقەشەی کێشەیەکی گرنگی دەکرد لەبەردەم دادگای باڵای وڵاتە یەککگرتوەکاندا. کێشەکە سەبارەت بەبڕێك پارەی زۆر وهەندێ مەسەلەی گرنگی یاسایی بوو.

لەکاتی موناقەشەدا، یەکێك لەدادوەرەکان بەبەڕێز(س)ی گوت: (ماوەی یاسایی لەیاسای شارستانیدا شەش ساڵە، وانیە؟ ).

بەڕێز(س) ڕاوەستاو چاوی بڕیەچاوی جەنابی دادوەر وپاشان بەڕەقی گوتی: (جەنابی قازی، لەیاسای شارستانیدا هیچ دەرفەت ومۆڵەتێك نیە.

بەرێز(س) ئاوا دۆخی دادگای وەسف کرد:

بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر دادگادا، وادەرکەوت پلەی گەرمای ژوورەکە دابەزیبێت بۆژێر پلەی سفر. من لەسەر هەق بووم، دادوەر... هەڵەبوو.من ئەوەم پێ ڕاگەیاند.بەڵام ئایا ئەم کارە منی نزیک کردەوە لەجەنابی دادوەر؟ نەخێر ئێستاشی لەسەربێت من پێم وایە یاسا پشتگیری من دەکات.دەشزانم لەجاران باشتر قسەم کرد.بەڵام نەمتوانی قەناعەتیان پێ بکەم.چونکە هەڵەیەکی تۆقێنەرم کرد، کاتێ بەپیاوێکی بەناوبانگم ڕاگەیاند، کەبەهەڵەدا چووە).

لەناوخەڵکیدا کەسانێکی زۆرکەم لەوژێکین.زۆربەمان لایەنگرین.زۆربەمان دووچاری ڕاوبۆچونی تێرکراو بە ڕژدی وگومان وترس ودڵپیسی وغرور بووین.

زۆربەی هاولاتیان ئارەزوویان لەوەنیە ئەو ڕاوبۆچونانەیان بگۆڕن کەسەبارەت بە(ئاین، یان قژچاککردن، یان کۆمۆنیزم یاخود کلارک گیبل... هتد)هەیانە.ئەگەر حەزت لەوەیە بەخەڵکی ڕابگەیەنیت کەبەهەڵەدا چوون، بەبێ زەحمەت ئەم پەرەگرافەی خوارەوە بخوێنەرەوە کەلەکتێبی(ژیری لەقۆناغی پێکهاتندا- the mind in the making)دانراوی پرۆفیسۆر(هارفی ڕۆبنسۆن)ەوە، وەرگیراوە:

هەندێ جار ڕاوبۆچونەکانمان دەگۆڕین بەبێ هیچ بەرهەڵستی یان هەستێکی بەرەنگار بوونەوەی بەهێز، وەلێ ئەگەر پێمان گوترا ئێوە لەسەر هەڵەن، ئەوا بێتاقەت دەبین ودڵی خۆمان ڕەق دەکەین.لەکاتی ئاساییدا هیچ گوێ نادەین بەبیروباوەڕەکانمان.بەڵام ئەگەر کەسێک هەوڵیدا لێمان زەوت بکات ئەوا دەروونمان پڕدەبێت لەڕق

وتوڕەیی.ئاشکرایە خودی بیروباوەڕەکان لای ئێمە ڕێزدار وپیرۆزنین، بەڵام شانازی کردنمان بەخۆمانەوە لەوڕێگەیەوە دووچاری هەڕەشە دەبێتەوە... چونکە ڕاناوی قسەکەری(من) گرنگترین وشەیە لەکار وبارە مرۆییەکاندا.ئینجا مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو وشەیەدا بەشێوەیەکی گونجاو، سەرەتای ئاقڵ بوونە... ئێمە هیچ بێتاقەت نابین.بەڵام بێتاقەت دەبین لەکاتێکدا دڵنیانەبین لەزانیاریەکانمان سەبارەت بەهەسارەی مەریخ، یان کاتێ واژەی (ئیبکتیسوس) بەڕێك وپێکی دەرنەبڕین... ئێمە حەزمان لەوەیە بەردەوام بین لەبڕواکردن وبەڕاست زانینی ئەوشتانەی کەوەکو هەقیقەت وەرمان گرتوون.ئەو بێتاقەت بوونەش کە بەهۆی گومان کردن لەو ڕاستیانە لەلامان پەیدا دەبێت؛ پاڵمان پێوە دەنێت تاکو جۆرەها پاساو بدۆزینەوە بۆئەوەی زیاتر دەستیان پێوەبگرین.لەئەنجامیشدا زۆربەی بیرکردنەوەکانمان بریتی دەبن لەدۆزینەوەی پاساو بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئەو بیروباوەڕانەی کەپێشتر بەڕاست ودروستمان زانیون.

جارێکیان ئەندازیارێکی دیکۆرم ڕاسپارد پەردەی ماڵەوەم بۆ دروست بکات.بەڵام کاتێ وەسڵی پارەکەی گەیشت تەواو سەرسام بووم وحەپەسام.

چەند ڕۆژێ دواتر، ئافرەتێکی هاوڕێم هات بۆ سەردانم وچاوی بەپەردەکان کەوت.کاتێ زانی نرخیان چەندە لەسەرەم کەوتووە.گوتی: (چی؟ !جێگەی نیگەرانیە.دەترسم هەقەکەی چەندقات لەسەرت زیاد کردبێت).

ئایا ئەم قسەیە ڕاست بوو؟ بەڵێ، قسەیەکی ڕاست بوو.بەڵام کەسانێکی زۆرکەم حەز بەبیستنی ئەو ڕاستیانە دەکەن کەدەشکێنەوە بەسەر دانایی وحیکمەتیانـدا.بەو جۆرەش، لەبەر ئەوەی منیش مرۆڤم.هەوڵمدا بەرەوانی خۆم بکەم. گوتم: لەڕاستیدا باشترین پەردەیە وهەرزانیشە.هیچ کەس ناتوانێ شتی باش وجوان، بەنرخی هەرزان بکڕێت... .هتد.

ڕۆژی دواتر، ئافرەتێکی تری هاوڕێم هاتەسەردانم.زۆردڵی چوو بەپەردەکاندا، بەدڵگەرمیەوە هەستی خۆی دەربڕی و، حەزی لەوەبو پەردەیەکی وەك ئەوەی من بۆماڵی خۆیان بکڕێت... کاردانەوەی من بەرانبەر ئەم ئافرەتە تەواو پێچەوانە بوو لەتەك ئافرەتەکەی ڕۆژی پێشودا، گوتم: (زۆرباشە، باڕاستت پێ بڵێم، نەمدەتوانی نرخەکەی بدەم، زۆر گران بوو، پەشیمانم لەوەی ئەو پەردانەم کڕیوە).

کاتێ بەهەڵەدا دەچین، ڕەنگە لەناخی خۆماندا دان بەوەدا بنێین کەبەهەڵەدا چووین.ئەگەر بەشێوەیەکی نەرم ونیان وزیرەکانەش ڕەفتارمان لەگەڵدا بکرێت، لەوانەیە لەبەردەمی خەڵکیشدا دان بەوەڕاستیەدا بنێین وشانازیش بەخۆمانەوە بکەین کەڕاشکاو وسینگ فراوانین.وەلێ ئەم مەسەلەیە پێچەوانە دەبێتەوە لەکاتێکدا یەکێك بیەوێت بەزۆری زۆرداری ڕاستیمان لێ داڕنێت.

(هوارس گیرلی) لەماوەی جەنگی ئەهلی لەئەمریکادا، یەکێك بوو لەڕۆژنامەنووسە بەناوبانگەکان، نەیاریەکی توندوتیژیشی هەبوو لەگەڵ سیاسەتەکانی لنکۆڵندا.ئەو پێی وابوو دەتوانێت، لەڕێگەی دەمبەدمە وگاڵتەپێکردن ولەکەدارکردنی ناوبانگەوە، لنکۆڵن واڵێ بکات بەشداری

ڕایەکانی بکات.بۆیە مانگ لەدوای مانگ و، ساڵ لەدوای ساڵ لەم هێرشانەی بەردەوام بوو.لەڕاستیشدا، وتارێکی تاڵ وگاڵتەئامێزانەی لەهەمان ئەوشەوەدا لەدژی لنکۆڵن بڵاوکردەوە کە(بۆس) تەقەی تێداکرد لەلنکۆڵن.

بەڵام ئایا ئەم هێرشە تاڵ وتفتانە، بونەهۆی ئەوەی لنکۆڵن، بێتەسەر ڕایەکەی گیرلی؟ نەخێر... هەرگیز گاڵتەپێکردن ولەکەدارکردنی ناوبانگ سودنابەخشن.

ئەگەر حەزت لەدەستکەوتنی پێشنیاری بەپێزهەیە سەبارەت بەچۆنێتی هەڵس وکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا وهەروەها بۆ هەڵسەنگاندن وڕێك کردنەوەی کەسایەتی خۆت، ئەوا ژیاننامەی (بنجامین فرانکلین) بخوێنەرەوە کەیەکێکە لەباشترین ئەو ژیاننامانەی تائێستا نوسراونەتەوە.هەروەها یەکێکیشە لەشاکارەکانی وێژەی ئەمریکی.

لەو ژیاننامەیەدا، فرانکلین پێمان دەڵێت چۆن بەسەر نەریتی دەمبەدمە ومشتومڕدا سەرکەوتوە وخۆی کردۆتە یەکێك لەدیپلۆماتە هەرەگرنگەکان لەمێژوی ئەمریکادا.

ڕۆژێکیان، هێشتر فرانکلین هەرزەکارێکی بێ دەربەست بوو، یەکێك لەهاوڕێکانی کێشایە لاوەو، ڕێژنەیەك ڕاستی بریندارکەر و ڕەقی پێ گوت.وەکو: تۆکەسێکی ناماقوڵیت، بیرو ڕاکانت زلەن ودەدرێن بەبناگوێی هەموو ئەوانەی لەگەڵتدا هاوڕانین.ئەمەش وایکردوە کەس بایەخ بەبیرۆکەکانت نەدات، هاوڕێکانیشت ئەوکاتە زیاتر خۆشحاڵ دەبن وڕادەبوێرن کەتۆ لەناویاندا نەبیت.تۆ زۆر دەزانیت بەجۆرێ کەس ناتوانێت هەواڵێکت پێ بدات.لەڕاستیشدا هیچ کەسێك هەوڵ نادات هیچ

هـەوڵێکت بـداتێ، چـونکە هـەوڵێکی وا دەبێتـە هـۆی دووردڵـی وسەریەشـەیەکی زۆر بـۆ ئـەو کەسـە... بـەوجۆرەش، تـۆ هـەرگیز لەئێستازیاتر زانیاریت دەست ناکەوێ وپتر فێرنابیت.لەکاتێکدا ئەوەی تۆ دەیزانیت کەشتێکی زۆر کەمە.

باشترین شتێ کەلـە فرانکلینـەوە هەستم پێ کـرد، ئـەوە بووکەئەو سەرزەنشتە زیرەکانەیـەی قبـوڵ کـرد.لەڕاستیدا زۆر مـەزن بـوو، هـەوڵی تەواویشی دابۆئـەوەی بـۆی دەربکـەوێت ئـەو قسەیە ڕاستـە، تـاکو بـەم هۆیـەوە هەسـت بکـات لەسـەرلێواری شکسـت هێنـان وکارەسـاتێکی کۆمەڵایەتیدا ڕاوەسـتاوە... بـەوجۆرە، لـەناکاو خـۆیی ڕاگـرت ودەست بەجێ دەستی کردە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی.

فرانکلین دەڵێت: ڕێسایەکم بۆ خۆم دروست کرد، ئەویش بریتی بوو لەقبوڵکردنی هـەموو ئـەو ڕەخنانـەی کـەخۆم بـەنیاز بـووم ئاراستەی کەسانی تری بکەم لەبەرانبەریشدا ستایشی دڵسۆزانەی ڕەخنەگرەکەم بکەم.تەنانەت قەدەغەیشم کرد لەخۆم لەکاتی قسەکردندا هەندێ لەو وشـانە بـەکاربێنم کەئامـاژەبەخـشی ڕایـەکی دیاریکراون.وەك(بەدڵنیاییەوە)، (بەبێ گومان)... هتد.

لەبری ئەو وشانە، هەندێ وشەی دیکەم بەکاردەهێنا وەکو(پێم وایە) (وای دادەنێم)، (تەسەورم وایە مەسەلەکە ئاوابێت)، یاخود(لەم کاتەدا وای دەبینم). هـەرکاتێ کەسێکی تـریش بـڕوای بەشتێ هەبوایە کەمن دڵنیابومایە لەناڕاستی ئەوشتە، خۆم دوور دەخستەوە لەوەی ڕاستە وخۆ ڕەخنەی لێبگرم وهەڵە وناتەواوی پێشنیارەکانی دەربخەم.

بەڵکو بەم جۆرە دەستم بەوەڵامدانەوە دەکرد: لەوانەیە لەهەندێ حاڵەت وبارودۆخدا، ڕایەکەی تەواوبێت.بەڵام لەئێستادا بارودۆخەکە جیاوازە.هێندەی نەبرد کاریگەری گۆڕینی شێوازی هەڵس وکەوتکردنم هەست پێکرد. هەروەها ئەو وتووێژانەش کەبەشداریم تێدا دەکردن، زیاتر تام وچێژیان هەبوو.ئەم خۆبەکەم زانینەم لەپێشکەش کردنی پێشنیارەکاندا، لەلایەن بەرانبەرەکانمەوە زیاتر پێشوازی لێدەکرا وکەمتر ڕەخنەی لێدەگیرا.

بەوەش توانیم والەبەرانبەرەکانم بکەم، وازلەهەڵەکانیان بێنن وپشتگیری من بکەن، ئەگەر خۆم لەسەر هەق بومایە.

ئەم شێوازە کەلەسەرەتاوە بەهۆی ئارەزوە سروشتیەکانەوە، ناڕەحەتیەکی زۆرم چەشت لەپێڕەوکردنیدا، دواتر زۆر ئاسان بوو.بەجۆرێ خوم پێوەگرت لەماوەی پانزدەساڵی ڕابردوودا هیچ کەس نەبوە گوێبیستی ڕستەیەکی پێچەوانەی خۆی بوبێت لەمنەوە... پێم وایە نهێنی سەرکەوتنی من لەبەرانبەر جەماوەردا بۆ پەیڕەوکردن لەو ڕێسایە دەگەڕێتەوە.هەروەها بویە هۆی بەهێزکردنی دەستەڵات وهەژمونی من لەجڤاتەگشتیەکاندا.هەرچەندە من وتار بێژێکی لێوەشاوەش نیم، کەچی بوومە یەکێك لەدیارترین ئەندامەکانی ئەوجڤاتانە... بەدوودڵیەوە وشەکانم لەکاتی قسەکردندا هەڵدەبژێرم.کەم جار زمانم ڕێکوپێك بووە.لەگەڵ ئەوەشدا توانیومە بەشێوەیەکی باش بیروبۆچوونەکانم بگەیەنم.

ئەم پێڕەوەی فرانکلین چۆن لەبواری کارکردندا سود دەبەخشێت؟ بادوو نمونەش لەوبارەیەوە وەرگرین:

(ف.ج.ماهۆنی) خەڵکی شاری نیویۆرک، شەقامی لیبرتی ١١٤، لەفرۆشتنی کەلوپەلی بازرگانی نەوتدا کاردەکا.ئەم فرۆشیارە تەندەری کڕینی هەندێ پێداویستی لەمامەڵەچییەکی خەڵکی(لۆنگ ئایلەند)ەوە بەدەست گەیشتبوو.ڕەزامەندی لەسەر پیشان درابوو، دەستیش کرابوو بەدروست کردنی کەلوپەلەکان.

لەناکاو شتێکی نائاسایی ڕوویدا... مامەڵەچییەکە لەگەڵ دۆست وهاوڕێ کانیدا ئەو شتەی باس کردبوو.ئەوان پەشیمانیان کردبوویەوە وهۆشیارییان پێدابوو کەهەڵەیەکی گەورەی کردوە. ئەوە چووبوە مێشکیەوە کە کەلوپەلەکان باش نین: زۆر درێژن،نا زۆر کورتن، وردە کاری تێدانەکراوە... هتد.

بەو جۆرە هاوڕێکانی بوونە هۆی دروست کردنی دوودڵی بۆ ئەم کابرایە.بۆیە پەیوەندی کرد بە بەڕێز(ماهۆنی)یەوە وسوێندی خوارد، ئەوکەلوپەلانەی ناوێت کەهێشتر لەقۆناغی دروستکردندان.

بەڕێز(ماهۆنی) لەبارەی ئەو کێشەیەوە دەڵێت: زۆر بەووردی سەرنجمدا، دڵنیابووم لەوەی کەلوپەلەکان زۆر تێروتەواون.جگەلەوە دڵنیاش بووم کەئەوپیاوە وهاوڕێکانی نازانن باس لەچی دەکەن.هەستم کرد هەڵەدەکەم ئەگەر ئەوەی پێ بڵێم.بۆیە بەرەو (لۆنگ ئایلەند) ڕۆشتم تاکولەوێ چاوم پێی بکەوێت.کاتێ بەرەو نوسینگەکەی چووم، هەستایەوە وبەرەو ڕووم هات ودەستی کردە قسەکردن.هێندە شڵەژابوو، لەکاتی قسەکردندا دەستی ڕادەوەشاند، جگەلەوە ڕەخنەی لەخۆم وکەلوپەلەکانیش گرت.لەکۆتایدا گوتی: (ئێستا چی دەکەیت بۆ ئەو مەسەلەیە؟ ).

بەو پەڕی هێمنیەوە گوتم: هەرچیەك تۆ پێت خۆش بێت وادەکەم.ئینجا پێم گوت: (تۆنرخی شتەکان دەدەیت، لەبەر ئەوە پێویستە چیت ئەوێ، ئەوەت پێ بدرێت.بەهەرحاڵ.ئەبێ بەرپرسیارێتیەکە لایەکمان هەڵیگرێن.ئەگەر تۆپێت وایە خۆت لەسەر هەقیت.ئەوا نیشانە شینەکەمان بدەرێ.هەرچەندە ئێمە لەسەر دوو هەزار دۆلار ڕێکەوتوین لەبەرانبەر ئەو کەلوپەلانەدا، بەڵام ئامادەین ئەورێکەوتنە هەڵبوەشێنینەوە وزیانی دووهەزار دۆلار قبوڵ بکەین لەپێناوی دڵی تۆدا.بەڵام پێویستە هۆشداری ئەوەشت بدەمێ، ئەگەر تۆ دەتوێ بەپێی خواستی تۆبێت.ئەوا دەبێ بەرپرسیارێتیەکە لەئەستۆبگریت.ئەگەر وازبێنیت ئێمە بەگوێرەی نەخشەکەی خۆمان جێبەجێی بکەین، کەپێمان وایە هەر ئەوەش باشە، ئەوکاتە ئێمە بەرپرسیارێتیەکانی لەئەستۆدەگرین).

لەکۆتایی ئەم وتوێژەدا، بەتەواوی هێمن بویەوە وگوتی: (زۆرباشە، لەسەرکاری خۆت بەردەوام بە، ئەگەرچی کەلوپەلەکان جێگەی ڕەزامەندی نەبن.خوایارمەتی دەرت بێت).

لەپاش دروستکردنیان، کەلوپەلەکان بەتەواوی بونەهۆی دڵخۆشکردنی ئەوپیاوە، بەڕادەیەك بەڵێنی دا لەماوەی هەمان وەرزدا دوو تەندەری تری هاوشێوە پێشکەش بکات.

کاتێ ئەوپیاوە دەستی لەبەرانبەرمدا ڕاوەشاند وپێی گوتم تۆ لەکارەکەت نازانیت.وای لێکردم کۆنترۆڵی خۆم لەدەست بدەم وپاڵی پێوەنام بۆمشتومڕکردن وپاساودان وبەرگری کردن لەهەڵوێستەکانم.ئەمەش پێویستی بەخۆڕاگرتنێکی زۆر هەبوو.بەڵام

مەسەلەکە بەباشترین شێوە کۆتایی هات. ئەگەر بم گوتایە تۆلەسەر هەڵەیت ودەستم بەمشتومڕبکردایە لەگەڵیدا. ئەوا مەسەلەکە زیاتر دەئاڵۆزا ودەگەشتە دادگاکان، هەروەها دڵ یەشان وزیانی مادی ولەدەست دانی مامەڵەچییەکی باشیشی لێدەکەوتەوە. بەڵێ بڕوای تەواوم کردبەوەی هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر بەبەرانبەرەکەت بێژیت تۆ بەهەڵەدا چویت).

بانموونەیەکی تر وەربگرین-لەبیرت بێت ئەم نموونانەی باسیان دەکەین لەوانەیە بەسەر هەزاران کەسدا دووبارە بوبێتنەوە... (ڕاف کرولی) وەك فرۆشیاری (کۆمپانیای تەختەی گاردنەر وتایلۆر) کاری دەکرد لەشاری نیویۆرك. کرولی باس لەوە دەکات، کەدابوا لەگەڵ هەندێ لەو بازرگانانەی تەختەدا مامەڵەبکات کەتەواو سەختگیربوون ومامەڵەیان ڕەق وناخۆش بوو. هەمیشە پێی دەگوتن ئێوە لەسەر هەڵەن. جگەلەوەش چەندین مشتومڕی لەگەڵیاندا کردبوو. کەچی هیچکام لەو ڕەفتارانە سودیان پێ نەگەیاندبوو. چونکە ئەو بازرگانانە وەکو یاریچی بایسبۆڵ وان، ئەگەر بڕیارێکیاندا بەئاسانی دەستی لێ هەڵناگرن. بەڕێز کرولی، هەستی کرد بەهۆی مشتومڕکردنەوە، کۆمپانیاکەی هەزاران دۆلار زیان دەکات. بۆیە کاتێ هاتە پەیمانگاکەی من بڕیاریدا دەست لەمشت ومڕکردن هەڵبگرێت. ئەی ئەنجامی ئەم بڕیاردانەی چی بوو... خۆی لەبەردەم قوتابییەکانی پەیمانگادا، ئاواباسی لەئەنجامی بڕیارەکەی کرد: بەیانییەکیان، زەنگی تەلەفۆنی نوسینگەکەم لێیدا. کەسێکی سەرقاڵ وتوڕە لەسەرهێڵ بوو. ڕاستە وخۆ بەوە دەستی بەقسەکانی کرد کەئەو لۆریە تەختەیەی نێردراوە بۆ کارگەکەمان باش نەبوو. پاش ئەوەی

چارەکێکی بارەکەی داگیرا.پشکنەری کارگە گوتویەتی ئەو تەختەیە (٥٥٪) لەخوار ئاستی پێویستەوەیە. لەبەر ئەوە، بارەتەختەکەیان ناوێت.

بەپەلە ڕومکردە کارگەکە ولەبیری ئەوەدا بووم ڕێگەیەکی لەبار بدۆزمەوە بۆچارەسەرکردنی کێشەکە. لەبارودۆخی ئاوادا.هەمیشە لیستی پلەبەندی تەختەکانم لەگەڵ خۆمدا دەبرد.بەهۆی شارەزایمەوە وەك پشکنەرێکی تەختە. دەمتوانی قەناعەت بەبازرگانەکە بکەم، کەتەختە کە لەئاستی پێویستدایە وئەو بەهەڵە پۆلێنی تەختەکانی کردووە.لەگەڵ ئەوەشدا بیرم لەوە کردەوە ئەو یاسایانە بەکار بێنم کەلەپەیمانگا فێریان ببوم.

پاش ئەوەی گەیشتمە کارگە کە، بینیم بریکارەکە و پشکنەری کارگە، مشتومڕێکی گەورەیانە وخەریکە دەست ئەدەنە یەخەی یەکتری.بەرە و ئەو لۆریە ڕۆیشتین کەنیوەی بارەکەی داگیرابوو.داوام کرد هەموو بارەکە دابگرن بۆ ئەوەی بزانم کارەکە چۆن ڕایی دەکەن.هەروەها داوام لەکابرای پشکنەرکرد هەر پارچەتەختەیەکی ناوێ، بیخاتە لایەکەوە و، ئەو پارچانەش کەبەلایەوە باشن بیخاتە لایەکی ترەوە.

پاش ئەوەی ئەو دەستی بەکار کرد ومنیش کەمێك ڕاوەستام وچاودێریم کرد، هەستم کرد پشکنەرەکە، ئەوەندە ووردە، تەنانەت لەیاساکانی پۆلێنی تەختەش دەردەچێت!!. جگەلەوە بۆم ڕون بویەوە ئەو کابرایە زانیاریەکی گشتی هەیە لەبارەی جۆرەکانی تەختەوە. بەڵام ئایا ڕێگری ئەو شێوازە پۆلێن کردنەم کرد کەئەو پێیەوە سەرقاڵ ببوو؟ نەخێراهەرگیزا تەناها چاودێریم دەکرد.پاشان دەستم کردە

ئاراستەکردنی هەندێ پرسیار سەبارەت بەهۆکاری ڕەت کردنەوەی هەندێ لەپارچە تەختەکان.بەبێ ئەوەی پێی بڵێم تۆ بەهەڵەدا چوویت.بەڵکو دڵنیام کردەوە ئەو پرسیارانە بۆیە دەکەم چونکە کۆمپانیاکەمان دەیەوێت لەداهاتودا ئەو تەختانەیان بۆ بنێرێت کەخۆیان حەزیان لێیەتی!!.

بەهۆی پرسیارکردنی نەرم ونیان و، گیانی هاوکاری کردن وپێداگری کردن لەسەر ڕاستی ودروستی قسەکانی. توڕەییەکەی هێور بویەوە رشەخەتە سەهۆڵەکەی نێوانیشمان ڕووی لەتوانەوە کرد.بەڕێکەوت تێبینیەکیشم پێ گوت، بویە هۆی دروست بوونی بیرۆکەیەك لەمێشکیدا کەئەوپارچە تەختانەش ئەم بەباشیان نازانێت، لەئاستی پێویستدان.سەرباری ئەوەش من هەر بەحەزەرەوە بیرۆکەکانم دەگەیانده ئەو.

هێدی هێدی شێوازی ڕەفتاری گۆڕا.دواجار دانی بەوەدانا کەلەبارەی جۆرەکانی تەختەوە شارەزایی تەواوی نیە.ئینجا پرسیاری هەرپارچەیەکی لێدەکردم کەلەلۆریەکە دادەگیرا!منیش تایبەتمەندیەکانی یەکە بەیەکەی پارچە تەختەکانم بۆ ڕوون دەکردەوە.پەیتا پەیتا پێشم ڕادەگەیاند: هەرکامیانت بەدڵ نیە، پێویست ناکات وەریان بگریت.ئەوەندەی نەبرد هەستی بەگوناهباری دەکرد لەبەرانبەر هەر پارچەتەختەیەکدا کەخستبویەلاوە.بۆیشی ڕوون بویەوە کەهەڵە کە، هەڵەی کارگەکەی ئەوانە کەئەو جۆرە تەختەیەی هەڵبژاردووە.لەکۆتایدا هەموو بارەکەی ویست.ئینجا چەکێکی بۆکردین بەنرخی هەموو بارە تەختەکە.

لەو ڕووداوەدا، بەهۆی کەمێك بیرکردنەوە وپێداگری کردن لەسەر بەهەڵە لەقەڵەم نەدانی کەسی بەرانبەرەوە، کۆمپانیاکە ڕزگاربوو لەزیانێکی مسۆگەر.

ئینجا من لەم بەشەدا، شتێکی تازەم نەگوتوە، چونکە نزیکەی نۆزدە سەدە لەمەوبەر، مەسیح گوتویەتی: (بەخێرایی، لەگەڵ ڕکابەرەکەتدا ڕێك بکەوە).

بەواتایەکی تر، لەگەڵ مامەڵەچی یان هاوسەرەکەت یاخود ڕکابەرەکەتدا مشتومڕمەکە.پێی مەڵێ تۆهەڵەیت وتوڕەیشی مەکە، بەڵکو کەمێك زیرەکی بەکار بێنە... ئەوەتا(٢٢٠٠ساڵ)بەرلەزاین، پادشا(ئەختەوی) ئامۆژگاریەکی کوڕەکەی دەکات کەئێمە ئەمڕۆ زۆر پێویستمان بەو ئامۆژگاریەیە.نزیکەی چوار هەزارساڵ بەرلەئێستا، شائەختەوی دەڵێت: (کوڕم، کەسێکی دیبلۆماسیبە، چونکە ئەوە یارمەتیت ئەدا بۆکەسب کردنی دیدو بۆچونەکانت)!!.

جائەگەر تۆش دەتەوێت دڵی خەڵکی ڕابکێشیت بەرە وشێوازی بیرکردنەوەی خۆت.ئەوا پێڕەوی لەم ڕێسایە بکە:

ڕێز بۆبەرانبەرەکانت دەربڕە. بەهیچ مرۆڤێکیش مەڵێ، تۆبەهەڵەدا چوویت.

# بەشی چواردەیەم

## ڕێگەیەکی گشتی بەرەو بیرکردنەوەی خەڵك.

ئەگەر ڕقت هەستا ویەك دووجنێوتدا، دەبینی هەلت دەستکەوتووە بۆخاڵی کردنەوەی تووڕەییەکەت. بەڵام ئەی کەسی بەرانبەرت چی؟ ئایانەویش بەشداری تۆدەکات لەوحەوانەوەیەدا؟ ئایا ئەم قیڕوهوڕە دوژمنکارانەیەت، ڕێگەت بۆئاسان دەکات تاکولەگەڵیدا پێك بێیت؟ .

(وردۆ ویلسۆن) دەڵێت: (ئەگەر مشتەکۆڵەکانت توندکردبێت وبێیت بەرەو ڕووم، بەڵێنت پێ ئەدەم مشتەکۆڵەکانی من لەوانی تۆ ڕەقتر دەبن. وەلێ ئەگەر بێت وپێم بڵێیت: وەرە بادابنیشین وگفتوگۆبکەین، بابیروبۆچونیشمان پێکەوە ناتەبابێت، بالەهۆکارەکانی ناکۆکی نێوانمان تێ بگەین. ئەودەمە حاڵی دەبین کەمن وتۆ زۆرناکۆك نین .بەڵکوبۆمان دەردەکەوێت ئەوخاڵانەزۆرکەمن کەلەسەریان ناکۆکین، لەبەرانبەریشدا ئەوخاڵانە زۆرترن کەهاودەنگین لەسەریان .جائەگەر نیاز و ئاراممان هەبێت بۆئەوەی ڕێکبکەوین، بەدڵنیاییەوە دەگەینە ڕێکەوتنی تەواوەتی).

هیچ کەس بەقەدەر ڕۆکفیلەر لەڕاستی ودروستی ئەم ڕستەیە حاڵی نەبووە. ڕۆکفیلەر لەهەموان زیاتر ڕووبەڕووی سوکایەتی پێکردن دەبویەوەلە (کۆلۆرادۆ)دا... .وڕێك لەخۆپیشاندانە خوێناویەکانیش کەلەمێژوی پیشەسازی ئەمریکادا ڕویانداوە دژبەکۆمپانیاکەی ئەم بوو. کرێکارەکانی کانگەکان داوای زیادکردنی کرێیان دەکردلە(کۆمپانیای کۆلۆرادۆ بۆسوتەمەنی وئاسن). ئەم کۆمپانیایەش ڕۆکفیلەر خاوەنی بوو(یان زاڵ بوو بەسەریدا).

ئەوەبوو لەئەنجامی خۆپیشاندانەکاندا کەلوپەلەکانی کۆمپانیا تێکوپێك دران وگروپەکانی پارێزگاری کردن بانگ کران وخوێن ڕژاو، تەقە لەمانگرتوەکان کراو، گوللەجەستەیانی کون کرد.

لەوکاتەدا، لەوکەش وهەوایەدا کەپڕبوو لەڕق وتوڕەیی، ڕۆکفیلەر ویستی مانگرتوەکان ڕاکێشێت بۆلای خۆی. ئەم ویستەشی هاتەدی. بەڵام چۆن؟ فەرموو لەگەڵ چیرۆکەکەیدا:

پاش چەند هەفتەیەك لەهەوڵدان بۆپەیداکردنی دۆست ولایەنگر، ڕۆکفیلەر دەستی کردە وتاردان بۆنوێنەرانی مانگرتوەکان. ئەم وتارانەی پارچەیەکی قەشەنگی ئەدەبین. ئەنجامی سەرسامکەریشی لێکەوتەوە. توانی ئەوشەپۆلی ڕق وتوڕەیی وتوندوتیژیە کۆتایی پێ بێنێت کەهەڕەشەیان لە ڕۆکفیلەر دەکرد. هەروەها سەرکەوتنی لەوەشدا بەدەست هێناکەهەندێ کەسی سەرسامکرد... ئەوپیاوە بەشێوەیەکی نەرم ونیان ودۆستانە ڕاستیەکانی ڕوون کردەوە، لەئەنجامدا توانی مانگرتوەکان بگێڕێتەوە بۆسەرکار، بەبێ ئەوەی بچوکترین ئاماژەش

بدات بەزیادكردنی كرێكانیان، كەئەوان لەبنەڕەتدا لەوپێناوەدا مانیانگرتبوو.

لێرەدا پێشەكی ئەو وتارە قەشەنگە دەخوێنینەوە، تێبینی بكە پڕە لەنەرم ونیانی... لەبیرت بێ ڕۆكفیلەر قسەی بۆكەسانێك كردوە كەبەرلەچەند ڕۆژێك ویستویانە لەملەوە هەڵی بواسن بەدارسێوێكی ترشدا.لەگەڵ ئەوەشدا، وتارەكەی لێوان لێوە لە دەستەواژەی وەك: من شانازی دەكەم كەلێرەم، لەپاش ئەوەی سەردانیماڵەكانتانم كردووچاوم بەژن ومنداڵەكانتان كەوت، ئەمڕۆ وەكوبێگانە ونەناس چاومان بەیەكتر ناكەوێت، بەڵكو وەكو هاوڕێ وئاشنا ودۆست چاومان بەیەك دەكەوێت بەگیانی دۆستایەتی وبەرژەوەندی هاوبەشەوە... هتد.

ڕۆكفیلەر وتارەكەی بەم شێوەیە دەست پێكرد: (ئەمڕۆمەزنترین ڕۆژی ژیانمە.چونكە یەكەمجارە بواری ئەوەم بۆدەڕەخسێ كەلەگەڵ نوێنەری بەكارهێنەر وكرێكارانی ئەم كۆمپانیا مەزنەدا كۆببمەوە.دڵنیاتان دەكەمەوە زۆرشانازی دەكەم كەلەنێوئێوەدام، بەدرێژایی ژیانم یادی ئەم كۆبونەوەیەمان دەكەمەوە.ئەگەر دووهەفتە لەمەوبەر ئەم كۆبونەوەیە ئەنجام بدرایە، ئەوامن وەكوكەسێكی نەناس وبێگانە لەنێوتاندا ڕادەوەستام وچەنددەموچاوێكی كەم نەبێ كەسی ترم نەدەناسی.بەڵام دوای ئەوەی هەفتەی ڕابردوو دەرفەتم بۆهەڵكەوت تاكو سەردانی هەموو ئۆردوگاكانی كێڵگەكانی خەڵوزی باشووربكەم، قسەلەگەڵ هەموو نوێنەرەكانیشدا بكەم جگەلەوانەی كەلەهەندەران بوون، هەروەها لەپاش ئەوەی سەردانی ماڵەكانتانم كرد وچاوم بەژن ومنداڵەكانتان كەوت، ئێستا وەكو دۆست وئاشناپێكەوەكۆدەبینەوە، نەك وەكونەناس، بەڵكو

وەکو هاورێ، بەگیانێکی دۆستانە وبەرژەوەندی هاوبەشەوە. پێم خۆشە ئەم هەلەبقۆزمەوە وپێکەوە باسی بەرژەوەندیە هاوبەشەکانمان بکەین... هتد.

ئایا ئەمەنمونەیەکی قەشەنگ نیەلەمەڕهونەری گۆڕینی دوژمن بەدۆست؟ باوادابنێین ڕۆکفیلەر شێوازێکیتری هەڵبژاردوە. ودەستی کردۆتە مشتومڕلەگەڵ کرێکارەکاندا و، بەڵگە وڕاستیەکانی بۆکۆکردونەتەوە وپێی ڕاگەیاندوون. با گریمانی ئەوەش دابنێین کە ڕۆکفیلەر توانیویەتی بەگوێرەی یاساوبنەمالۆژیکیەکان ئەوەبسەلمێنێت کەکرێکارەکان لە سەر هەڵەن، لەوکاتەدا چی ڕوی ئەدا؟ .بێگومان لەوحاڵەتەدا دەبوەهۆی زیاتر توڕەکردنی کرێکارەکان. وخرۆشاندنیان بۆ شۆڕشکردن.

ئەگەر دڵی بەرانبەرەکەت پڕبێت لەڕق وکینەبەرانبەرت، ئەوائەگەر هەموو لۆژیکی دونیایشی لەگەڵدا بەکاربێنیت، هەر ناتوانیت قەناعەتی پێ بکەیت. باوکەتوڕەکان وسەرکردە ومێردمنداڵەکان وژنانی هەمیشەیاخی وتەرێزکەریش، پێویستە ئەوە باش بزانن کەبەرانبەرەکانیان نایانەوێت ڕاوبۆچونەکانیان بگۆڕن. هیچ کەسیش ناتوانێ ناچاریان بکات بەوەی ڕاوبۆچونەکانیان بگۆڕن. بەڵام ئەگەر لەوەی لەواقیعدا هەین، نەرم ونیان بین لەگەڵیاندا، دەتوانین وایان لێ بکەین ئەوگۆڕانە دروست بکەن.؟ لنکۆڵن سەدساڵ لەمەوبەر، قسەیەکی کردووە، فەرمووبزانە دەڵێ چی... دەڵێت: (پەندێکی کۆن هەیە دەڵێت: دڵۆپێک هەنگوین لەگاڵۆنێ ژەهر زیاترمێش لەخۆی کۆدەکاتەوە) خەڵکیش وانە. جاتۆئەگەر دەتەوێت کەسی بەرانبەرت بەرەودیدو

بۆچونەکەی خۆت پەلکێش بکەیت.یەکەمجار قەناعەتی پێ بکەکەتۆ هاوڕێی دڵسۆزی ئەویت... چونکە ئەمە دەبێتە ئەوردلۆپە هەنگوینەی کەدواتردڵی وبیرکردنەوەیشی بەرەو تۆپەلکێش دەکات.

بزنسمانەکان بڕوایان وایە، باشترە لەگەڵ کرێکارە مانگرتوەکاندا نەرم ونیان بجوڵێنەوە.بۆنمونە: نزیکەی دووهەزار وپێنج سەد کرێکارلەکۆمپانیای (وایت مۆتۆرز) لەپێناوی زیادکردنی کرێدامانیان گرت.ئەم کردەوەیە نەبویە هۆی تورەکردنی سەرۆك (ڕۆبەرت.ف.بلاك).نەشبویە هۆی ئەوەی هەڕەشەبکات وباس لەستەم ولەکۆمۆنیزم بکات.بەڵکوهات ستایشی کرێکارە مانگرتوەکانی کرد.نەك هەر ئەوەندە، بگرە لەڕۆژنامەی (کلفلاند)دا ئاگادارییەکی بڵاوکردەوە وتیایدا دەستخۆشی لە کرێکارەکان کردبووکە بەوشێوەئاشتی خوازانە داخوازیەکانی خۆیان دەربڕیوە).کاتێکیش زانی تەواوبێتاقەت بوون، دەستکێش وپێداویستی یاری (بایسبۆڵ)ی بۆکڕین وداوایشی لێکردن لەیاریگەری کۆمپانیاکە یاری تۆپێن بکەن. جگە لەوەش هۆڵێکی تایبەتی (بولینگ) ی بەکرێ گرت بۆئەو کرێکارانەی ئارەزوی ئەویاریە دەکەن..

ئەم نەرمونیانیەی سەرۆك (بلاك)وەك هەرنەرمونیانیەکی تر، بویەهۆی دروست بونی دۆستایەتی وئاشنایەتی.ئەوەبوو کرێکارە مانگرتوەکان گسك وعەرەبانەی خۆڵڕشتنیان هێنا ودەستیان کردەپاککردنەوەی دەوروبەری کارگەکە و، کۆکردنەوەی هەموو ئەوخەوش وخاڵ وئاغزەجگەرە وپیس وپۆخڵیانەی لەدەوری کارگەکەدابوون.بیرلەوە بکەرەوە! کرێکارە مانگرتووەکان لەهەمان ئەوکاتەدا کەمانیانگرتبوو

بۆزیـادكردنی كـرێ ودانـنـان بـه یەكێتیەكەیانـدا، خۆیـان هەسـتان كارگەكـەیان پـاككردەوە... ڕووداوی لـەم شـێوەیە لەمێـژوی جـەنگی كرێكـاران لەئـەمریكادا نـەبینراوە.ئـەوەبوو ئـەم مانگرتنـە لـەماوەی هەفتەیەكدا بەچارەسـەرێكی مـام ناوەنـدی كۆتـایی هـات، بـێ ئـەوەی ببێتەهۆی ڕق وتوڕەیی.

دانیـاڵ وبستـەر، یـەكێك بـوو لـەپارێزەرە هەرەسـەركەوتوەكان، لەگـەڵ ئەوەشـدا لەبـەهێزترین مورافەعەكانیـدا، تێبینـی گـەلێكی دۆسـتانەی پێشكەش دەكـرد، وەكـو: (مەسـەلەكە دەگەڕێتـەوە بۆدادگـا بـۆ ئـەوەی لێكۆڵینەوەبكات لە... ).

(بەڕێزان ڕەنگە ئەمە شایستەی بیركردنەوەبێت)... ( بەڕێزان، لێرەدا هەندێ ڕووداو هەیە كەبڕوام وایە ئێوەی بەڕێزیش فەرامۆشتان نەكردون ولێیان بێ ئاگانین) یاخود(ئێوە بەهۆی شارەزاییتان بەسروشتی مرۆڤ بەئاسانی دەرك بەبایەخی ئەو ڕاستیانە دەكەن)...

نەفشاری خوێنی خۆی بەرزكردەوە ونەهەوڵیشیدا ڕاوبۆچونی خۆی بسەپێنێت بەسەر بەرانبەرەكەیدا، بەڵكو(وبستەر) شێوازی نەرم ونیان ودۆسـتانەی بـەكار هێنـا.ئەمـەش بویـە یارمـەتی دەری بـۆ ئـەوەی ناوبانگێكی فراوان پەیدابكات.

لەوانەیە تۆبانگهێشت نەكرێیت بۆچارەسەركردنی كێشەی مانگرتنێك یـان مورافەعـەكردنێك لەبـەردەم دادگـادا، بـەڵام ڕەنگـە حەزبكـەیت كرێـی خانوەكـەت دابـەزێنیت.ئایا لـەوبوارەدا شێوازی نـەرم ونیان سودت پێ دەگەیەنێت؟ باسەرنجی ئەوەش بدەین.

ئەندازیار(و.ل.ستروٚب) حەزی لەوەبوو کرێی خانووەکەی کەم بکاتەوە.لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی خاوەنی خانووەکە زۆر سەختگیرە.بەڕێزستروٚب لەوتارێکیدا لەبەردەم قوتابیانی پۆلدا گوتی: (لەنامەیەکدا بۆم نوسیی هەرکەماوەی بەڵێننامەکە کۆتایی هات.خانووەکە چۆڵ دەکەم.لەڕاستیشدا، نەمدەویست خانووەکە چۆڵ بکەم.بەڵکو دەمویست لەخانووەدا بمێنمەوە، ئەگەر بتوانم کرێکەی کەم بکەمەوە.وەڵ باروودۆخەکە نەگەنجاو ویاخی بوو.چونکە زۆرێک لەکرێ چییەکانی ئەوکابرایە هەوڵیان دابوو، کرێ کەم بکەنەوە بەڵام هەموویان شکستیان هێنابوو. هەریەکێکیش لەو کرێچییانە بگریت.پێیان دەوتم کابرای خاوەن ماڵ سەختگیرە وکەس ناتوانێ مامەڵەی لەگەڵدا بکات.سەرباری هەموو ئەوانەش لەدڵی خۆمدا گوتم: (بەم مامەڵەیە، شێوازێکی ترلە لەمەڵس وکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا فێردەبم، باتاقی بکەمەوە.دواتر سەیردەکەم بزانم چی ڕوودەدات).

هەرکە نامەکەی بەدەست گەشت، خۆی وسکرتێرەکەی هاتن بۆچاوپێکەوتنم.لەبەردەرگا سڵاوێکی(چارلی شواب) ئاسام لێکرد، من تەواو دڵگەرم ولێوان بووم لەنیازی پاك.

لەسەرەتادا باسی کرێی گرانی خانووەکەم نەکرد، بەڵکو ڕادەی سەرسامی خۆمم بەماڵەکە بۆ دەربڕیی.بڕوام پێ بکە، ڕاستگۆبووم لەستایش کردنەکەمدا. پیرۆزبایم لێکرد کەتوانیویەتی بەوشێوەیە خانووەکە دروست بکات. دواتر ئەوەم پێ ڕاگەیاند کەحەزدەکەم ساڵێکی تریش لەخانووەکەدا بمێنمەوە.بەڵام ناتوانم کرێکەی بدەم.کابرای خاوەن ماڵ، لەهیچ کرێچییەك شێوازی ئاوای نەدیبوو.بۆیە نەیدەزانی چۆن وەڵام

بداتـەوە.ئینجـا دەسـتی کـرد بەباسـکردنی سەریەشـەکانی لەگـەڵ کرێـچیەکانی تـردا.یـەکێك لـەو کرێـچیانە چواردە نامـەی بـۆ نوسیبوو، کەیەکێك لەونامانە سوکایەتی زۆری تێدابوو.یەکێکی تریان هەڕەشـەی ئـەوەی کردبـوو کەئەگـەر کرێـچیەکەی قـاتی سـەرەوە بێـدەنگ نـەکات وکۆتـایی بـەو هـەموو زرم وهـوڕەی قاتی سـەرەوە نـەهێنێت، ئـەوا بـەڵێن نامەکـە هەڵدەوەشـێنێتەوە پاشـان بـەمنی گـوت: (چەندخۆشـحاڵم کرێـچیەکی پڕقەناعـەتی وەك تـۆم هـەبێت)... بـەبێ ئـەوەی خـۆم داوای بکـەم، کـەمێك کرێکـەی دابەزانـد.وەڵێ من دەمویست زیـاتر دایبـەزێنێت بۆیە ئـەو نرخـەم پـێ ڕاگەیاند کەبۆمن ئاسانەبیدەم... کەچی بـەبێ وەی تاکـــە وشـــەیەك بڵێـــت قـــسەکەمی پەســـەند کـــرد وکرێکـــەی بۆدابەزانـدم.کـاتێکیش لـەماڵ چـوە دەرەوە، ئـاوڕی دایـەوە بەلامـدا وپرسـیی: ( چ جـۆرە ئەندازەیـەکی ناوماڵـت ئـەوێت بـۆت بخەمـە ناوماڵەکە؟ ).

ئەگـەر من هـەوڵم بدایە بەوشێوازانە کرێکە دابـەزێنم کەخـەڵکانی تر پێڕەوی دەکەن. دڵنیام دووچاری هەمان ئەو شکستە دەبووم کەئەوان دووچاری ببوون. لەمەشدا دەرکەوت ستایش کردن وشێوازی نەرم ونیان ودۆستانە سود بەخشە. چەند ساڵێك لەمەوبەر، کاتێ مێردمنداڵێکی پێ پـەتی بـووم... ڕۆژانـە بەدارسـتانێکدا تـێ دەپـەڕیم تاکودەگەشـتمە قوتابخانەی گوندەکە کەدەکەوتە باکوری ڕۆژئاوای (میسوری).ڕۆژێکیان چیرۆکێکی ئەفسانەیم خوێندەوە سەبارەت بەخۆر وبا.

(خۆر وبا) ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە لەسەر ئەوە کامیان بەهێزترن. (با) بەخۆری گوت: (ئێستا دەیسەلمێنم من بەهێزترم. ئەو پیاوەپیرە

دەبینێ کەپاڵتۆلەبەرکردوە؟ گرەو دەکەم لەسەرئەوەی من لەتۆ خێراتر دەتوانم پاڵتۆکەی پێ فڕێ بدەم).

خۆر لەپشتی هەورەوە ڕاوەستا، با بەوپەڕی سەختی هەڵیکرد تاکو ئەو ڕادەیەی خەریك بوو ببێتە گەردەلول.بەڵام تاچەندە ڕەشەباکە بەهێزبوایە، پیاوەپیرەکەش زیاتر پاڵتۆکەی لەخۆیەوە دەپێچا.

دواجار، ڕەشەباکە هێوربویەوە وخۆی دابەدەستەوە، ئینجاخۆر لەپشتی هەورەکان هاتەدەرەوە و زەردەخەنەیەکی نەرم ونیانی بۆپیاوەکە کرد.هێندەی نەبرد پیاوەکە ڕوخساری سڕی وپاڵتۆکەیشی داکەند... لەئەنجامدا خۆر بەبای گوت: نەرم ونیانی وهاوڕێیەتی هەمیشە بەهێزترە لەتوندوتیژی وسەخت گیری!.

کەهەرزەکاربووم ئەم ئەفسانەیەم دەخوێندەوە. ناوەڕۆکی ئەو ئەفسانەیە بەکردەوە لەشاری (بۆستن)دا بەرجەستە دەبوو.ئەوشارەی کەمەڵبەندی زانست وڕۆشنبیریە وهەرگیز بەخەوتنیش نەمدیبوو.لەو شارەدا لەسەر دەستی (دکتۆر ا.ه.ب)دا بەرجەستەدەبوو کەلەپاش سیی ساڵ بوویە یەکێك لەقوتابییەکانم... فەرموو ئەوە تۆ و، ئەوەش بەسەرهاتی دکتۆری ناوبراو کەخۆی لەبەردەمی قوتابییەکانی تردا گێڕایەوە:

لەو ڕۆژگارەدا.لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی شاری بۆستن، پڕکرابوون لەڕیکلامێکی پزیشکی هەڵبەستراو، ڕیکلام بۆ کۆمەڵێ دکتۆری پسپۆڕی لەباربردن و نۆژداری جادوباز، کەبانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە نەخۆشینەکانی پیاوان چارەسەردەکەن. کەلەڕاستیدا نێچیرەکانیان لەخشتەدەبرد ودەیان تۆقاندن بەقسەی وەك: نەمانی پیاوەتی

ونەخۆشینی ترسناکیتر... شێوازی کاری ئەمانەتەنها بریتی بوو لەوەی قوربانیەکەی ژێردەستیان بەردەوام لێوان بێت لەترس وتۆقین، هەروەها لەوەشدا خۆی دەبینیەوە کەدەرمانی ساختە وبێ کەڵکیشیان دەدایە... لەباربەرەکان، ببونە هۆی ڕودانی حاڵەتی زۆری مردن.لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی کەمیان دادگایی کرابوون.زۆرینەیان باجێکی کەمیان ئەدا، یان دەستەڵات وهەژمونی سیاسییان هەبوو! .ئیدی لەدادگایی کردن قوتاردەبون.

کێشەکە بەشێوەیەکی مەترسیدار ئاڵۆزا وتەنانەت دانیشتوانی بۆستن ڕق وتوڕەییان بەرزکردەوە.واعیزەکان لەبلندگۆکانەوە پرۆتسۆی ئەو ڕۆژنامانەیان کرد وداوای ڕەحمەت وبەزەیی خوایان دەکرد بۆ ڕاوەستاندنی ئەو ریکلامانە. ڕێکخراوە مەدەنیەکان وبزنسمان ویانەکانی ژنان ودێر ورێکخراوەکانی لاوانیش، هەریەك لەلای خۆیانەوە پرۆتستۆی ریکلامەکانیان کرد، بەڵام هیچ سودێکی نەبوو... پێکدادانی سەختیش دروست بوو لەئەنجومەنی یاسادانانادا لەپێناوی ئەوەدا ئەو ڕاگەیاندنە درۆزنانە بەناشەرعی لەقەڵەم بدرێت، وەڵێ بەهۆی ئەوەی ڕاگەیاندنەکان خاوەنی هەژمونی سیاسی بوون پێکدادانانەی نێوئەنجومەنیش هیچ ئەنجامێکی نەبوو.

لەوکاتەدا، دکتۆر(ب) سەرۆکی کۆمەڵەی هاوڵاتیەباشەکان بوو لەبۆستندا، کۆمەڵەکەیشی هەموو ڕێگەیەکی گرتەبەر، سەرجەم ئەو ڕێگەیانەش بەشکست دەگەیشتن. وادەردەکەوت دژایەتی کردنی تاوانبارەکان هیچ ئومێدێ نابەخشێ.لەم ناو ماوەدا، لەنیوەشەوێکدا، دکتۆر هەوڵێکی تریدا کەتائەودەم لەبۆستندا کەس بیری لەهەوڵێکی بەو

جۆرە نەکردبویەوە. هەوڵیدا نەرم ونیان بێت وهەست بەمەسەلەکان بکات.هەوڵیدا کارێ بکات سەرنوسەرەکان خۆیان ئارە زوو بکەن ئەو ڕیکلامانە لەڕۆژنامەکانیاندا ڕابوەستێنن. هێنای نامەیەکی نوسی بۆسەرنوسەری ڕۆژنامەی (بۆستن هیراڵد)، باسی ئەوەی بۆکردبوو کەزۆر سەرسامە بەڕێکوپێکی ڕۆژنامەکە.هەمیشە دەیخوێنێتەوە، چونکە دابەشکردنی هەواڵەکان لەوڕۆژنامەیەدا ئاشکرایە وبێ لایەنانەیشە.هەروەها نوسەرەکانیشی ئایابن. ڕۆژنامەیەکی خانەوادەیی قەشەنگیشە.دکتۆر (ب) ڕای گەیاندبوو کەبەلای ئەوەوە ڕۆژنامەکە، باشترین ڕۆژنامەیە لەئینگەلتەرای نوێدا، قەشەنگترین ڕۆژنامەشە لەئەمریکادا.

(بەڵام) دکتۆر بەردەوام دەبێت لەسەرقسەکانی ودەنوسێت: برادەرێکم کچێکی بچکۆلانەی هەیە.برادەرەکەم بۆی گێڕامەوە کەئەو کچەبچوکە یەکێك لەو ڕیکلامانەی ناوڕۆژنامەکەی تۆی بەدەنگێکی بەرز خوێندۆتەوە، ڕیکلامەکە بانگەشەبووە بۆ لەبار بەرێکی پسپۆڕ.دواتر کچەکە پرسیاری لەباوکی کردوە ئەو ڕستە یانی چی؟ . بەڕاشکاوی، برادەرەکەم هەستی بەقەڵسی کردووە، نەیزانیوە چی بڵێت وچۆن وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە.ڕۆژنامەکەی تۆدەچێتە باشترینماڵەکانی بۆستنەوە.جائەگەر ئەو ڕوداوە لەماڵی برادەرەکەی مندا ڕووی دابێ، ئایا ناگونجێت لەماڵێکی تریشدا ڕوبدات؟ .

ئەگەر تۆ خۆت کچێکی بچکۆلانەت هەبێت، حەزئەکەیت ئەو جۆرە ڕیکلامانە بخوێنێتەوە؟ ئەی ئەگەر خوێندیەوە وپرسیاری لەبارەوەکرد، چۆنی بۆشیی دەکەیتەوە؟ .

مایەی نیگەرانیە کەڕۆژنامەیەکی قەشەنگی وەکو ڕۆژنامەکەی تۆ-کە لەهەموو ڕویەکەوە تێر وتەواوە-ئەم دیاردەیە تێدابێت کەوابکات باوکان خۆیان دوربخەنەوە لەوەی بۆکچەکانیانی باس بکەن. ئایا ئەگەری ئەوە لەئارادانیە هەزاران خوێنەری تریش هەمان ئەوهەستەیان هەبێت کەمن هەستم پێ کردووە؟ .).

لەپاش دوو ڕۆژ، سەرنوسەری (بۆستن هیراڵد) نامەیەکی نوسیی بۆ دکتۆر(ب). دکتۆر ئەو نامەیەی بۆ ماوەی سێ یەکی سەدەیەك پاراستبوو، کەبویە قوتابی لەپەیمانگاکەی مندا، نامەکەی دابەمن. ئێستا نامەکەم لەبەردەستدایە ومێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ(١٣/١٠/١٩٠٤) .

*دکتۆر ا.هـ.ب*

*بۆستن، ماس*

*بەڕێز وخۆشەویست:*

بەڕاستی هەستم بەمنەتباری کرد لەبەرانبەرتدا، بەهۆی ئەو نامەیەوە کەئاراستەی سەرنوسەرت کردبوو، بەڕادەیەك بەم دواییانە بڕیارم هاتە سەرئەوەی شتێ بکەم کەلەوکاتەوە دەست بەکار بووم دوودڵ بووم لەسەری.

لەبەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممەوە، بڕیارمداوە ڕۆژنامەی(بۆستن) دەربچێت وخاڵی بێت لەوڕیکلامە قێزەونانە.هەروەها ڕیکلامی کارتە پزیشکیەکان وداودەرمانی هێو کەرەوەش لەڕۆژنامەکەدا ناهێڵێم. بەڵام ئەو ڕیکلامانەی کەناتوانین هەڵیان بوەشێنینەوە، بەشێوازێك بڵاویان دەکەینەوە کە نەبنە هۆی بێزاری و تەرێزکردن.جارێکی تریش سوپاسی

نامەجوانەکەت دەکەم کەلەم ڕووەوە بۆیە یارمەتی دەرم. تکام وایە بەردەوام هاوڕێت بم.

*دڵسۆزتان و.ا.هاسکل*

*بڵاوکاری ڕۆژنامە*

(ئیسۆپ) خزمەتکارێکی یۆنانی بوولە کۆشکی کریزیس دەژیا، لەشەش سەد ساڵ بەر لەزاینەوە، ئەفسانە نەمرەکانی دادەڕشت.لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڕاستیانەی کەلەبارەی سروشتی مرۆڤەوە فێریان ببوو، هەمان ئەو ڕاستیانە کەلەبۆستن وپەرمەنگەهامدا بوون، وەك چۆن لەیازدەسەدە لەوە وبەرەوە لەئەسینادا وەك ڕاستی سەرنج یان لێ دراوە.خۆر لەباخێراتر دەتوانێ پاڵتۆکەت پێ دابکەنێت .نەرم ونیانی وقسەی خۆش ودۆستایەتی لە تووڕەبون و هەڵچون، زیاتر دەتوانن وابکەن لە خەڵکی بەخێراییەکی زۆر ترەوە بیرو بۆچونەکانیان بگۆڕن؛ ئەوقسەیەت لەبیربێت کەلنکۆڵن گوتی: (دڵۆپێ هەنگوین مێشی زیاتر کۆدەکاتەوە لەگالۆنێك ژەهر.هەرکات ویستت خەڵکی بەرەو لای بیروبۆچونی خۆت ڕابکێشیت.لەبیرت نەچێ ئەم ڕیسایە بەکار بهێنە: بەنەرم ونیانی دەست بەقسەکردن بکە.

# بەشی پازدەیەم

## نهێنی سوکرات

لەکاتی قسەکردن وهەڤپەیڤینت لەگەڵ کەسێکدا، لەو مەسەلانەوە دەست پێ مەکە کە هەردووکتان لەسەریان ناکۆکن... بەڵکو پێداگریە لەسەرئەوشتانەی کەتیایاندا هاودەنگ وکۆکن... تاچەندە دەتوانیت.هەوڵ بدە دووپاتی ئەوە بکەیتەوە کەهەردووکتان هەوڵ بۆگەیشتن بەیەك ئەنجام دەدەن وتاکەجیاوازی نێوانیشتان لەمیکانیزم وهۆکاری گەیشتن بەئامانجەکەدایە، نەك لەخودی ئامانجەکەدا.

کەسی بەرانبەرت پەلکێش بکە بۆئەوەی هەرلەسەرەتاوە بڵێت: (بەڵێ، بەڵێ).تادەتوانیت دووری بخەرەوە لەوەی بڵێت: (نەخێر).

پرۆفیسۆر(ئۆفرستریت) لەکتێبەکەیدا(دانانی کاریگەری لەسەر هەڵس وکەوتی مرۆڤ) دەڵێت: وەڵامی نێگەتیڤ سەخت ترین گرفتە کەبتوانیت بەسەریدا زاڵ بیت.کاتێ مرۆڤێك دەڵێت(نەخێر).هەموو هەست ونەستی داخوازی ئەوەی لێدەکەن لەسەر ئەو ڕایەی، لەسەر ئەو نەخێرە بەردەوام وپێداگربێت... لەوانەیە دواجار هەست بکات(نەخێر) وەڵامێکی هەڵەیە، بەڵام بە لە بەرچاوگرتنی کیبریای خۆی اکاتێ شتێ دەڵێت، پێویستە

دەست بەقسەی خۆیەوە بگرێت.بەم پێیە، زۆر گرنگە لەڕووە ئیجابییەکانەوە دەست بەوتوێژ بکەین!).

قسەکەری لێزان، ئەوکەسەیە کەهەر لەسەرەتاوە کۆمەڵێ وەڵام بە(بەڵێ) لەبەرانبەرەکەیەوە بەدەست دێنێت.چونکە لەو بارەدا، کردارە دەروونیەکانی گوێگرەکەی بەرەو لایەنە باشەکان پەلکێش دەکات.ئەم پرۆسەیە لەجموجوڵی تۆپی بلیار دەچێت.کاتێ لێیدەدەیت بەرەو هەر لایەکی مێزەکە، هێزێ پەیدادەکات لێدوورکەوتنەوە، هێزێکی مەزنی وا کەدەیگەڕێنێتەوە بۆ لاتەنیشتەکەی بەرانبەر.

ڕێ وشوێنە دەرونیەکان لێرەدا زۆر ڕوونن.کاتێ مرۆڤێك دەڵێت(نا)بەبێ ئەوەی خۆی بزانێت چی وتوە، شتێکی وتوە کە زیاترە لەوشەیەکی دووپیتی.چونکە هەموو جەستەی(بەڕژێنەکان ودەمار وماسولکەکانیەوە) بۆ ئەو حاڵەتی ڕەت کردنەوەیە یەکدەگرن... هەروەها پاشگەزبونەوەیەکی کاتی جەستەیی هەیە، یان ئامادەباشی بۆ پاشگەزبونەوە.هەموو کۆئەندامی دەمار–ماسولکە، ئامادەدەبن بۆ دوورکەوتنەوە لەقبوڵکردن.

بەڵام کاتێ مرۆڤ دەڵێت(بەڵێ).هیچکام لەو چالاکیە جەستەییانەڕونادەن. بەڵکو جەستە جموجوڵێکی چالاکانە دەست پێ دەکات بۆقبوڵکردن وپێڕەو کردنی شێوازی کراوە.لەبەر ئەوە.تاچەندە بتوانین هەرلەسەرەتاوە وەڵامی ئەرێی بەدەست بێنین، ئەوەندەش ئەگەری سەرکەوتنمان زیاد ئەبێت بۆسەرنج ڕاکێشانی بەرانبەرەکەمان بەرەو ئامانجەکانمان.

وەڵامی ئەرێنی، پرۆسەیەکی زۆر ئاسانە.هەرچەندە زۆریش فەرامۆشکراوە! تەنانەت زۆرجارخەڵکی هەست بەگرنگی وبایەخی خۆیان دەکەن، بەڵام لەڕێی هەستکردنیانەوە بەدوژمنایەتی.

کارێ بکە کەسێك هەر لەسەرەتاوە بڵێت(نەخێر)، یان مامەڵەچی یان منداڵ یاخود ژنەکەت هەرلەسەرەتاوە بڵێن(نەخێر).ئەودەم، دەبێ ئارامگری ودانایی فریشتەکان بەکاربێنێت بۆ گۆڕینی ئەو وەڵامە نەفرەتیە بۆبارێکی ئەرێنی.

بەکارهێنانی شێوازی ئەرێنی، بویە هۆی ئەوەی(جیمس ئیبرسۆن) بەڕێوەبەری بانکی(گرینوریچ سایفینگ) لەشاری نیویۆرك، بتوانێت پارێزگاری لەمانەوەی مامەڵە چیەکی باڵابکات.بەڕێز ئیبرسۆن دەڵێت: (ئەوپیاوە هات ژمارەیەکی بانکی بکاتەوە، منیش لیستی ئاسایی داواکاریم پێدا تاکوپڕی بکاتەوە.بەخەیاڵێکی ڕەحەتەوە هەندێ لەپرسیارەکانی وەڵام دایەوە.بەڵام ئامادەنەبوو، وەڵامی هەندێ پرسیاری تر بداتەوە... بەرلەوەی لێکۆڵینەوە وخوێندنەوە بکەم، لەمەڕ پەیوەندیە مرۆییەکان، دەمگوت هەرمامەڵە چیەك ئامادەنەبوو ئەو زانیاریانە بدات، ژمارەی بانکی پێنادرێت وبۆی ناکرێتەوە... ئێستا شەرمەزارم کەلە ڕابردوودا ئەو هەڵەیەم کردووە.ئاساییە گەربەم وەڵامە هەست بەدڵخۆشی بکەم، چونکە بەمیوانەکەم نیشان ئەدا کەکێ سەرۆکە ونابێت هیچ کەسیش توخنی یاساکانی بانك بکەوێت.بەڵام ئەم ڕەفتارە، نەبویە هۆی ئەوەی ئەو کابرایەی کەهاتبوو هاوکاری وپشتگیری خۆیمان پێشکەش بکات، هەست بەگرنگی وسنگ فراوانی بکات.

ئەوبەیانیە بڕیارمدا کەمێك لەدانایی ئەسپ بەکاربێنم.بڕیارمدا باس لەوەنەکەم کەبانك چی دەوێت.بەڵکو باس لەوە بکەم کەمامەڵەچیەکە چی دەوێت.سەربارى ئەوەش، بڕیارمدا هەرلەسەرەتاوە پەلکێشی بکەم بۆ ئەوەی بڵێت(بەڵێ).بۆیە هاوڕایی خۆم بۆ دەربڕی وپێم گوت ئەو پرسیارانەی کەناتەوێ وەڵامیان بدەیتەوە، بەهیچ شێوەیەك بایەخیان نیە.

(بەڵام) پێم گوت، (باوای دابنێین تۆ لەپاش مردنت پارەیەکت لەم بانکەدا هەیە، ئایا پێت خۆشە بەگوێرەی یاسا ئەو پارەیەت بگێڕینەوە بۆ یەکێك لەخزمەکانت؟ .لەوەڵامدا گوتی: (بێگومان!).

-ئایا پێتوانیە باشتروایە ناوی خزمێکی خۆتمان پێ بدەیت تاکو لەحاڵەتی کۆچی دوایی تۆدا، بتوانین ئارەزوەکەت بێنینەدی بەبێ هیچ جۆرە هەڵەکردن ودواخستنێك؟ .

* دووبارە گوتی: (بەڵێ).

دەست بەجێ شێوازی هەڵس وکەوتی ئەو کابرا مامەڵەچیە گۆڕا، بەتایبەت کاتێ زانی ئێمە لەپێناوی خۆماندا داوای ئەو زانیاریانە ناکەین، بەڵکو لەپێناوی خۆیدا داوای دەکەین.بۆیە بەرلەوەی بانك بەجێ بهێڵێت، نەك تەنها زانیاری تێرو تەسەل لەبارەی خۆیەوە پێدایِن، بگرە ژمارەیەکی بانکی کردەوە کەدایکی لێی سودمەندبێت، بۆیە بەدەرونێکی بێ خەوشەوە، وەڵامی هەموو پرسیارەکانیشی لەمەڕدایکی دایەوە.

هەستم کرد، لەمیانەی پەلکێش کردنیەوە بۆگوتنی وشەی(بەڵێ)، هەموهەستەکانی لەبیرچویەوە، تەنانەت زۆر شادومانیش بوو بەجێ بەجێ کردنی ئەوپێشنیارانەی کەدەمخستە بەردەمی).

(جۆزیف ئەلیستۆن) کەکاری(فرۆشیار) دەکات لەکۆمپانیای(وستینگ هاوس)، گوتی: (پیاوێك لەناوچەکەماندا هەیە، کۆمپانیاکەمان حەزی دەکرد هەندێ شتی پێ بفرۆشێت.بەرلەمن لەماوەی دەساڵدا، فرۆشیارەکانی تر هەوڵیان لەگەڵدا دابوو، بەڵام نەیانتوانی بوو هیچی پێ بفرۆشن.پاش ئەوەی بەرپرسیاریتی ئەو ناوچەیەم وەرگرت.بۆماوەی سێ ساڵ سەردانی نوسینگەکەیم دەکرد، بێ ئەوەی هیچ داواکاریەکی کرینم لێیەوە دەست بکەوێت.دواجار، پاش سیازدەساڵ لە هاتوچۆکردن وسەردان وباس وخواسی کرین.توانیمان چەند بزوێنەرێکی پێ بفرۆشین. ئەگەر بزوێنەرەکانی بەدڵ بوایە، دڵنیام چەندسەد دانەیەکی تریشی دەکری.

من دڵنیابووم لەوەی بزوێنەرەکان باشن، بەوجۆرە، کاتێ پاش سێ هەفتە چومەوە بۆسەردانی، هەستم دەکردبەرەو سەرکەوتن هەنگاو دەنێم.

بەڵام هەنگاوەکانم زۆر پەلیان نەهاویشت، چونکە ئەندازیارەکە بەرەو ڕووم دەهات ولەناکاو پێی ڕاگەیاندم(ئەلیستۆن!ناتوانین بزوێنەرەکانی ترت لێ بکرین)بەقەڵسیەکەوە لێم پرسی: (بۆچی؟ ).

-چونکە بزوێنەرەکانت پلەی گەرمییان زۆر بەرزدەبێتەوە وناتوانم دەستیان لێ بدەم.

زانیم قسەکردن وچەلەحانێ هیچ سودێکیان نیە. چونکە لەزووەوە ئەو ڕێگەیەم تاقی کردبویەوە.بیرم لەوە کردەوە وەڵامی(بەڵێ) بەدەست بێنم.گوتم: (زۆرباشە. بەڕێز سمیس ئێستا سەرنج بدە.من سەد لەسەد لەگەڵ ڕاکەی تۆدام. بزوێنەرەکان پلەی گەرمییان بەرزە نابێ تۆهیچیان

بکڕیت.ئەبێ تۆ بزوێنەرێ بکڕیت کەپلەی گەرمییەکەی بەرزتر نەبێت لەپلەی گەرمی بزوێنەرەکانی یەکێتی نیشتمانی بۆپیشەسازیە ئەلکترۆنیەکان.وانیە؟ !).

لەگەڵمدا هاوڕابوو، بەو جۆرە یەکەم(بەڵێ)م دەست کەوت.تێکڕای پلەی گەرمی لای یەکێتی نیشتمانی بۆپیشەسازیە ئەلکترۆنیەکان، پێویستە ٧٢پلەی فەهرنهایت بێت، لەگەڵ پلەی گەرمی ژورەکەدا.وایە یان نا؟ .

(بەڵێ)، (ڕاستە.بەڵام بزوێنەرەکانی تۆ پلەی گەرمییان بەرزترە).

لەوبارەوە قسە ودەمبەدمەم لەگەڵدا نەکرد... گوتم: (پلەی گەرمی ژوری توانەوە(قاڵکردن) چەندە؟ ).

-نزیکەی ٧٥پلەی فهرنهایت.

*زۆرباشە، ئەگەر پلەی گەرمی ژوری قاڵکردن ٧٥ پەبێت، ٧٢پلەی بزوێنەرەکەیشی بخەیتەسەر.دەکاتە ١٧٤ پلە.ئایا ئەم گەرمیە، بەس نیە بۆ ئەوەی دەستت بسوتێنێت؟ .

-دووبارە گوتی: (بەڵێ).

* زۆرباشە، ئایا باشترنیە دەستت لەبزوێنەرەکە دووربخەیتەوە؟ .

-گوتی(بەڵێ)پێم وایە تۆلەسەرهەقیت). ئینجا بۆماوەیەك قسەو باسمان کرد.پاشان کچەسکرتێرەکەیی بانگ کرد و تەندەرێکی بەبڕی (٣٥/٠٠٠)دۆلار پێدام تاکو بایی ئەو برەپارەیە کەلوپەل بۆ بهێنم.

چەندین ساڵ وهەزاران دۆلارم لەدەست چوو، بەرلەوەی تێبگەم لەوەی دەمبەدمە هیچ سودێکی نیە.بەڵکو زۆر بەسودترە لەگۆشەنیگای ئەوانی ترەوە سەرنجی شتەکان بدەین وپەلکێشیان بکەین بۆ ئەوەی بڵێن(بەڵێ).

سوکرات، وەئاگاهێنەرەوەی ئەسینا، گەنجێکی قەشەنگ بوو، هەرچەندە تەمەنی بەپێی پەتی بردەسەر.لەگەڵ کچێکدا هاوسەرگیری کرد، تەمەنی کچەکە نۆزدە ساڵان بوو، بەڵام سوکرات لەتەمەنی چل ساڵیدابوو.قژی سەری ڕوتابویەوە وسەری ساف ببوو.ئەوپیاوە شتێکی کرد، کەزۆرێك لەپیاوانی مێژوو نەیانتوانیوە بیکەن: ئەم توانی ڕێڕەوی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی‌بگۆڕێت.هەنوکەش، لەپاش بیست وسێ سەدە لەمردنی ئەو پیاوە، یادی دەکرێتەوە وەك ژیرترین کەس کەتوانیویەتی قەناعەت بەبەرانبەرەکانی بکات وکاریگەری لەسەر ئەم جیهانە پێکدا ئاڵاوە دابنێت.

شێوازی سوکرات چۆن بوو؟ ئایا بەخەڵکی دەگوت ئێوە لەسەر هەڵەن؟ نەخێر، ئەوە سوکرات نیە وابڵێت.ئەو زۆر ژیر و هۆشمەند تربوو لەوەی وابڵێت، شێوازەکەیشی کەئێستا بە(شێوازی سوکرات) ناو دەبرێ.پێداگری لەوە دەکات کە کەسی بەرانبەر پەلکێش بکرێت بۆ ئەوەی بڵێت (بەڵێ).پرسیاری وای دەکرد کەڕکابەرەکەی لەگەڵیدا هاوڕابێت.ئیدی هاوڕایی لەدوای هاوڕایی لەبەرانبەرەکەیەوە بەدەست دەهێنا وپڕ بەباوەشێك وەڵامی (بەڵێ)ی لەبەرانبەرەکەیەوە وەردەگرت وکۆی دەکردنەوە. بەردەوام جۆرە پرسیارێکی دەکرد، تاکو بەرانبەرەکەی والێدەکرد هەرلەخۆیەوە باوەش بەو ئەنجامەدا بکات کە بەر لەچەند خولەکێك ڕەتی دەکردەوە.

جارێکی تر، کەویستمان زیرەکی خۆمان پیشان بدەین وکەسی بەرانبەرمان قەناعەت پێ بکەین کەلەسەر هەڵەیە.باسوکراتی پێ پەتیمان

لەبیربێت وپرسیاری نەرم ونیانانەی وابکەین کەبەرانبەرەکەمان ڕابکێشێت بۆ گوتنی(بەڵێ).

چینیەکان پەندێکیان هەیە کەلێوانە لەدانایی ڕۆژهەلات ودەڵێت: (هەرکەس بەنەرم ونیانی هەنگاو بنێت، زیاتر ڕێ دەکات (یان ڕێگەیەکی درێژتر دەبڕێت).

ئەرچینیانە پێنج هەزارسالْ لەسروشتی مرۆڤ کۆڵیونەتەوە، ئەوجا توانیویانە ئەو پەندە وەدەست بخەن: (هەرکەس بەنەرم ونیانی هەنگاوبنێت، ڕێگەیەکی درێژتردەبڕێت).

ئەگەر ئەتەوێت خەڵکی ڕابکێشیت بۆ لای شێوازی بیرکردنەوەی خۆت، ئەوا پێڕەوی لەم ڕێسایە بکە: کەسی بەرانبەرت پەلکێش بکە بۆ ئەوەی دەست بەجێ بێژێت: (بەڵێ).

# بەشی شانزەیەم

## چۆن هاوکاری بەدەست دێنیت؟

ئایا زیاتر بڕوات بەو بیرۆکانە نیە کەخۆت دەیان دۆزیتەوە ، وەك لەو بیرۆ کە ئامادە کراوانەی کە لەسەر سینیەکی زیوین پێشکەشت دەکرێت؟ ئەگەر وایە، ئایا شتێکی ناپەسەند نیە گەر بیروبۆچونەکانت بەسەر بەرانبەرەکانتدا بسەپێنیت؟ ئایا حیکمەتێکی زیاتر نیە گەر تۆ تەنها پێشنیار پێشکەش بکەیت و لێ گەڕێیت بەرانبەرەکانت، خۆیان بیر لەبەرەنجامەکان بکەنەوە؟ .

بۆنمونە: ئەدلۆف سلتز، کەیەکێك بوو لەقوتابییەکانم، ڕووبەڕووی گرفتێك بوویەوە، گرفتەکەش ئەوە بوو کەدەبوا گەرم وگوڕی دروست بکاتەوە لەنێو دڵی هەندێ فرۆشیاری ئۆتۆمبیلدا کەبەتەواوی ئومێد بڕاو ببوون، پاش ئەوەی داوای کۆبونەوەیەکی گشتی کرد، پیاوەکانی هاندا تاکو ئاگاداری بکەنەوە لەوەی کەهەرکامیان بۆ چونی چیە سەبارەت بەکۆبونەوەکە و چاوەڕوانی چی لێ دەکات.لەکاتی قسەکردندا، بۆ چونەکانی ئەوانی لەسەر ڕوپەڕێك نوسیەوە، پاشان گوتی: (هەموو ئەو شتانەتان ئەدەمێ کەئێوە چاوەڕوانی دەکەن، ئێستاش بەڕاستی پێیان

ڕادەگەیەنم منیش چ چاوەڕوانیەك لەئێوە دەکەم) ڕێژنەی وەڵامەکان بەپەلە دابارین: دڵسۆزی، دەست پاکی، چالاکی وئومێد، گروپێکی کارکە ڕۆژانە هەشت کاتژمێرکار بکات، تەنانەت پیاوێك ئامادەیی دەربڕی چوارده کاتژمێر لەڕۆژێکدا کاربکات... بۆیە کاتێ کۆبونەوە کەتەواو بوو گوڕوتین وچالاکیەکی نوێ لەناو ئەندامانی کۆبونەوە کەدا پەیدا ببوو. بەڕێز (سلتز)یش دواتر باسی لەوە کرد کەبڕی فرۆشراوەکانیان لەدوای ئەو کۆبونەوەیە زۆر بەڕوونی زیادی کرد.

سلتز هەروەها دەڵێت: (ئەو پیاوانە پەیمانێکی ئەخلاقییان دابوو، لەبەر ئەوەی من لەسەر پەیمانەکەم مابومەوە، هەریەکێك لەوانیش هەوڵی ئەدا لەسەر پەیمانەکەی بمێنێتەوە... ئەو پرسیارەش کەمن دەربارەی ئارەزوو بۆ چونەکانیان لێم کردن گوشادیەك بوو کەبەڕاستی ئەوان پێویستیان بوو).

هیچ پیاوێ نیە حەزبکات بەوەی پێی بگوترێ فلان شت بکە.بەڵکو هەموومان حەزمان بەوەیە کەبەئارەزوی خۆمان شت بکڕین وبەگوێرەی بیروبۆچونەکانی خۆشمان هەڵس وکەوت بکەین. حەزدەکەین پرسیارمان لێ بکرێت سەبارەت بە حەز وخولیاو پێویستی وبۆچونەکانمان .

باحاڵەتی (ئەیۆژین ونسۆن) وەك نمونە وەربگرین.ئەم پیاوە هەزاران دۆلاری لەدەست دا بەرلەوەی ئەم ڕاستیە فێرببێت. ئەم پیاوە لەستۆدیۆیەکدا کاری دەکرد کەدیزاینی جل وبەرگی بۆ بازرگانەکان دەکرد. بۆماوەی سێ ساڵی ڕەبەق هەموو ڕۆژێك سەردانی یەکێك لەدیزاینەرە بەناوبانگەکانی جلوبەرگی شاری نیویۆرکی دەکرد. (ونسۆن) خۆی دەڵێت: هەرگیز چاوپێکەوتنمی ڕەت نەدەکردەوە، بەڵام

هەرگیز هیچیشی لێ نەدەکڕیم.زۆر بەووردی سەرنجی دیزاینەکانی دەدا... ئینجا دەیگوت: (بەڕێز ونسۆن، وانازانم ئەمڕۆ لەسەر هیچ شتێ ڕێ بکەوین).

لەپاش سەدوپەنجا جار شکست خواردن، ئەوجا (ونسۆن) بیری لەوە کردەوە کەلەوانەیە دووچاری شڵەژانی بیرو بۆ چون بوبێت.بۆیە بڕیاریدا هەفتانە ئێوارەیەك تەرخان بکات بۆ لێکۆڵینەوە لەشێوازی کاریگەری دانان لەسەر هەڵس وکەوتی مرۆڤ وگەشەدان بەبیرۆکەی نوێ کەدواجار ببێتە هۆی سەرهەڵدانی دڵگەرمی تازە.

لێرەدا بیری لەوە کردەوە، شێوازێکی تازە پێڕەو بکات.هەندێ دیزاینی ئامادە نەکراوی هێنا کەهێشتر هونەرمەندەکان کاریان تێدا دەکرد.بەهەڵەداوان هات بۆ دوکانی بازرگانەکەو گوتی: (زەحمەت نەبێ ئەگەر یارمەتیەکی بچوکم بدەیت.هەندێ دیزاینی تەواو نەکراوم پێیە، دەتوانیت ئەوەندە زەحمەت بکێشی پێم بڵێیت چۆن تەواویان بکەم لەگەڵ داخوازیەکانی تۆدا دەگونجێن؟ ).

کابرای بازرگان ماوەیەکی زۆر تەماشای دیزاینەکانی دەکرد، بێ ئەوەی تاکە وشەیەك لەدەمی بێتە دەرەوە، پاشان گوتی: (بەڕێز ونسۆن، چەند ڕۆژێك لای من دایان بنێ ودوایی بگەڕێرەوە بۆلام).

ونسۆن ڕۆشت ولەپاش سێ ڕۆژ گەڕایەوە بۆ لای وهەموو پێشنیارەکانی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ستۆدیۆ وبەگوێرەی ئەو پێشنیارانە دیزاینەکانی تەواو کرد.ئەی ئەنجامی ئەم کارەچی بوو؟ ئەنجامەکەی ئەوە بوو هەموو دیزاینەکان قبوڵ کران.

ئۆمانگ لەمەوبەر ئەم ڕووداوە ڕووی داوە.لەوکاتەوە تائێستا بەردەوام کڕیارەکان داوای دیزاینی زیاتری لێ دەکەن، هەموو دیزاینەکانیش بەگوێرەی بۆ چوونەکانی خۆی تەواو دەکات... ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی بەڕێز ونسۆن زیاتر لەشەش سەد دۆلار دەستکەوتی لەعمولەدا ببێت.ئەو خۆی دەڵێت: ئێستە هەستدەکەم کەبۆچی لەسالأنی ڕابردوودا شکستم دەهێنا.چونکە من هەوڵم ئەدا شتێ بەکڕیارەکان بفرۆشم کەخۆم پێم وابوو شتێکی باشە. ئێستا بەپێچەوانەوە، هەوڵ ئەدەم بیروبۆ چوونەکانیم پێ بڵێیت، بۆیە ئێستا ئەو واهەست دەکات خودی خۆی دیزاینی جلوبەرگەکان دەکات، هەر بەڕاستیش وایە.چونکە ئێستا من کاڵاکەم نافرۆشم، بەڵکو ئەو خۆی دێت ولێم دەکڕێ).

ئەو دەمەی (تیۆدۆر ڕۆزڤلت) فەرمانداری نیویۆرك بوو، کارێکی زۆر باشی کرد، بەردەوام پەیوەندی باشی بەسەرکردە سیاسیەکانیەوە هەبوو... ناچاری کرد بوون هەندێ ڕیفۆرم بکەن کەئەوان ڕقییان لێی دەبووەوە. لەماوەی دادێ شێوازی کاری (ڕۆزڤلت) دەیخەنە بەرچاو: هەرکات پێویست بوایە پۆستێکی بەتاڵ پڕبکرێتەوە، سەرکردەکانی بانگ دەکرد بۆ ئەوەی پێشنیارەکانیان بخەنە بەرچاو. ڕۆزڤلت دەڵێت: (لەسەرەتاوە سەرکردەی حیزبێکی شکستخواردوویان پێشنیاردەکرد. بۆیە منیش پێم ڕادەگەیاندن ئەو جۆرە پیاوانە لەڕووی سیاسیەوە ناگونجێن، هەروەها جەماوەریش قبوڵی ناکەن.ئینجا ناوی ڕابەری حیزبێکی تریان دەهێنا، ئەگەرچی کەس دژایەتی نەدەکرد، بەڵام کەسانێکی کەم پشتیوانیان لێ دەکرد. بۆیە پێم دەگوتن: ئەم جۆرەپیاوانەش لەئاستی داخوازیەکانی میللەتدانین... داوام لێدەکردن

بەدووی پیاوێکی تردا بگەڕێن... سێیەمین جار ناوی پیاوێکی تاڕادەیەك گونجاویان دەبرد. بەڵام ئەمیش تەواو گونجاو نەبوو.

بۆیە سوپاسم دەکردن وداوام لێدەکردن هەوڵێکی تر بدەن وناوێکی تریێشکەش بکەن. دواجار پێشنیاری چوارەمیان قبوڵ دەکرا. چونکە ئەوانیش هەر ئەو ناوەیان پێشنیار دەکرد کەمن خۆم هەڵم بژاردبوو...

دواجار لەپای ئەو هاوکاری کردنەیاندا سوپاسم دەکردن، ئەو پیاوەشم بۆ پڕکردنەوەی پۆستەکە دەست نیشان دەکرد کەئەوان پێیان باش بوو، فەزڵی هەڵبژاردنەکەیم بۆ ئەوان بەجێ دەهێڵاو پێیم دەگوتن: من ئەو پیاوەم بۆ قایل کردنی دڵی ئێوە لەوجێگەیەدا دانا، ئێستا نۆرەی ئێوەیە دڵی من قایل بکەن.

ئەوانیش وایان دە کرد! بەتایبەت کاتێ چاکسازیەکانی ڕاژەی شارستانی وبەخشین لەباجیان پەسەندکرد.

شیاوی گوتنە (ڕۆزڤلت) زۆر دوور ڕۆشتوە لەڕاوێژکردن بە دەوروبەرەکەی و ڕێزگرتن لەبیروبۆچونەکانیان. هەرکاتێ کەسێکی بۆ پۆستێ دابنایە، کارێکی دەکرد سەرکردەکانی دەوری واهەست بکەن خۆیان ئەوکەسەیان داناوە وبیرۆکەکە، بیرۆکەی خۆیان بووە.

کابرایەکی ئۆتۆمبیل فرۆشیش لەشاری (لۆنگ ئایلەند) هەمان شێوازی مامەڵەی بەکار هێنا، کاتێ ویستی ئۆتۆمبیلێکی بەکار هاتوو بفرۆشێتە پیاوێکی ئوسکۆتلەندی وهاوسەرەکەی. ئەم کابرایە ئۆتۆمبیل لەدوای ئۆتۆمبیل پیشانی کڕیارەکەی دەدا. بەڵام کابرای ئوسکۆتلەندی دڵی لەسەر هیچ کامیان ڕانەدەهات ولەهەرکامیاندا ناتەواویەکی دەدۆزیەوە، ئەمیان گونجاونیە وئەویان کۆنە وئەوی تریان زۆر گرانە...

لەبەرانبەر ئەم هەڵوێستەدا، کابرای فرۆشیار پەنای بردە بەر قوتابییەکان (چونکە خۆیشی قوتابی پەیمانگاکەی من بوو) تاکو هاوکاری بکەن .ئێمە ئامۆژگاریمان کرد وازلەفرۆشتن بە(ساندی) بێنێت وکارێك بکات بە(ساندی) خۆی بێت ئۆتۆمبیل بکڕێت. پێمان گوت: لەبری ئەوەی (ساندی) بڵێیت پێویستە ئاوابکەیت ، بۆچی وازی لێ نایەنیت ئەوبێت پێت بڵێت پێویستی بەوەیە شتێکی بۆ بکەیت؟ لێ گەڕێ باوا هەست بکات بیرۆکەکە هینی خۆیەتی.

وادەرئەکەوت ئەم شێوازە ڕاست بێت، فرۆشیارەکەش هەروایکرد... کاتێ کڕیارێ ویستی ئۆتەرە کۆنەکەی بگۆڕێتەوە بەئۆتۆمبیلێکی نوێ... فرۆشیارەکە دەیزانی لەوانەیە ساندی ئەم ئۆتۆمبیلە بەکار هاتووەی بەدڵ بێت.

بۆیە دەست بەجێ تەلەفۆنەکەی هەڵگرت وداوای لەساندی کرد، بێت بۆلای وسەبارەت بەو ئۆتەرە هەندێ ئامۆژگاری پێشکەش بکات!!.

کاتێ ساندی گەیشت، فرۆشیارەکە پێی گوت: تۆ کەسێکی زیرەك ولێهاتویت ونرخی ئۆتۆمبیل دەزانیت. بەڵکو سەیرێکی ئەم ئۆتۆمبیلە بکەیت وتاقی بکەیتەوە ودوایی پێم بڵێیت بەچەن بیکڕم باشە؟ .

ساندی زەردەخەنەیەکی درێژی بۆ کرد ودەستی کردە پشکنینی ئۆتۆمبیلەکە. ئینجا دەستی کردە لێخوڕینی لە(جمایکا) وە بەرەو(فرست هیلتر).کاتێك گەڕایەوە گوتی: (ئەگەر بتوانیت ئەم ئۆتۆمبیلە بەسێ سەد بکڕیت، مامەڵەیەکی قازانجدارت کردووە). فرۆشیارەکە لێی پرسی: (ئەگەر تۆبەو نرخە دەستت بکەوێت، ئامادەیت لێم بکڕیت؟ ).

دواجار ئەم بگرە وبەردەیە بەنوسینی بەڵێننامەی کڕینی ترۆمبیلەی کۆتایی هات... هەمان ئەم شێوازە لەلایەن دروستکەرێکی کەلوپەلی تیشك گرتنی پزیشکیەوە پیڕەوکرا، کاتێ ویستی کەلوپەلەکانی بفرۆشێتە یەکێك لە نەخۆشخانە گەورەکانی (بروکلین)... نەخۆشخانەی بەشێکی تازەی کردبویەوە ودەیویست باشترین پێداویستیە پزیشکیەکان لە ئەمریکادا لەو بەشەدا دابنێت.دکتۆر(ل) ی بەرپرسی بەشی تیشکی نەخۆشخانەکە، بەتەواوی پەرێشان ببوو بە هۆی ئەو هەموو فرۆشیارەی کەدەهاتنە کنی وبەرهەمەکانی خۆیانیان دەخستە بەردەمی وداوایان لێدەکرد کەلوپەلەکانیان لێ بکڕێت.

لەنێو ئەو فرۆشیارانەدا، یەکێکیان لەوانی ترلێوەشاوە وزیرەك تربوو، لەوانی ترباشتر دەیزانی چۆن چۆنی چارەسەری سروشتی مرۆڤ دەکرێ، ئەوە بوو نامەیەکی بۆ دکتۆری ناو براو نوسی وتیایدا گوتبووی: (بەم دواییانە کارگەکەمان جۆرە کەلوپەلێکی تازەی تیشك گرتنی بەرهەم هێناوە، بڕی یەکەمی ئەو ئامێرانە گەشتۆتە نوسینگەکەمان، بەڵام تەواو نین.ئێمە ئەم ڕاستیە دەزانین، دەمانەوێت چاکیان بکەین، زۆر سوپاست دەکەین ئەگەر دەرفەتت ببێت وسەرێکمان لێ بدەیت وڕای خۆتمان پی بڵێیت تاکو بزانین چۆن ئەو ئامێرانە تەواوبکەین لەگەڵ ئیشەکانی ئێوەدا دەگونجێن... من دەزانم تۆ زۆر سەرقاڵیت، لەبەر ئەوە خۆشحاڵ دەبم هەرکاتی بۆ تۆ گونجاوبێت ئۆتۆمبیلەکەی خۆمت بۆ بنێرم وسەردانمان بکەیت).

دکتۆر(ل) لەبەردەم پۆلەکەیدا، بەم جۆرە باسی لەچیرۆکەکەی کرد وگوتی: (زۆر سەرسام بووم کاتێ نامەکەم بەدەست گەیشت، چونکە

پێشتر نەمدیبوو خاوەنی کارخانەیەکی تری ئامێری تیشك دروست کردن داوای ئامۆژگاریم لێ بکات، ئەمە وای لێکرم هەست بەگرنگی ڕبایەخی خۆم بکەم. ئەو هەفتەیە زۆر سەرقاڵ بووم. لەگەڵ ئەوەشدا رادەی ئێوارە خوانێکی ڕۆژێکی ئەو هەفتەیەم هەڵوەشاندەوە، بۆ ئەوەی بچم چاوم بەئامێرەکان بکەوێت... هەرچەندە وردتر سەیری ئامێرەکانم دەکرد.زیاتر پێیان سەرسام دەبووم.

هیچ کەس هەوڵی نەدا ئامێرەکانم پێ بفرۆشێت. بۆیە هەستم کرد بیرۆکەی کڕینی ئەو ئامێرانە بۆ نەخۆشخانەکە بیرۆکەی خودی خۆمە.بەهۆی باشی ئامێرەکانەوە کڕیمن، داوام کرد بۆم بگوازنەوە وبۆم دابمەزرێنن).

چەندساڵێك لەمەوبەر کابرایەکی تری خەڵکی (نیوبرانسویك) هەمان شێوازی مامەڵەی تاقی کردەوە. توانی من بکاتە کڕیاری خۆی.ئەوکاتە، من پلانم دادەنا بۆ ڕاوەماسی کردن ولێخوڕینی بەلەم لە(نیوبرانسویك)دا. نامەیەکم بۆ نوسینگەیەکی گەشتوگوزار نووسی تاکو زانیاریم لەوبارەیەوە پێ بدەن. ناو وئەدرەسەکەم خرایە سەر لیستە گشتیەکە. ئەوەندەی نەبرد دنیایەك نامەونامیلکەم لەخاوەنی خێوەتگەو ڕێبەرانی گەشتوگوزارەوە پێ گەیی. دووچاری شۆك بووم و نەمدەزانی کامیان هەڵبژێرم. لەناو هەموویاندا، یەکێکیان کارێکی زۆر زیرەکانەی کردبوو.ئەم هاتبوو ژمارەی تەلەفۆن وناوی کۆمەڵێك کەسایەتی شاری نیویۆرکی پێدام کەپێشتر خزمەتگوزاری پێشکەش کردبوون، داوای لێکرم لەوان بپرسم کەئەم کابرایە تاچ ئاستێ خزمەتی ئەوانی

کردووە! تاکو لەزمانی ئەوکەسایەتیانەوە تیَ بگەم خیَوەتگاکەی ئەم کابرایە چەندە خزمەتگوزارە.

سەرسام بووم، چونکە یەکیَك لەو ناوانەم دەناسی کەئەو کابرایە پیَشکەشی کردبووم. بۆیە پەیوەندیم پیَوەکرد وپرسیاری خزمەتگوزاریەکانی ئەو خیَوەتگایەم لیَکرد.لەئەنجامدا هەرکە گەیشتمە شویَنی مەبەست، پەیوەندیم بەو خیَوەتگایەوە کرد.

هەموو خاوەن خیَوەتگاکانی تر هەولیان ئەدا خزمەتگوزاریەکانیانم پیَ بفرۆشن، بەلاّم یەکیَکیان وازی لیَهیَنام بۆ خۆم خزمەتگوزاریەکانی لیَ بکرِم: بۆیە (هەر ئەویشی براوە بوو).

بەو جۆرە، ئەگەر دەتەویَت دلَی خەلَك بەلای شیَوازی بیرکردنەوەی خۆتدا رِابکیَشیت، کاریەم رِیَسایە بکە کەدەلَیَت: لیَ گەرِیَ بەرانبەرەکەت هەست بکات بیرۆکەکە، بیرۆکەی خۆیەتی.بیست وپیَنج سەدە لەمەوبەر، یەکیَك لەدانایانی ولاّتی چین، کەناوی(لاوستی)یە هەندیَ شتی باسکردووەکە دەکریَ خویَنەران بەکاری بیَنن، ئەو دەلَیَت: هۆکاری پیَك گەیشتنی رِووبارو دەریاکان، ئاوی سەدان سەرچەشمەی چیاکانە کەدەکریَ لەوان خوارتریش بن... بەو جۆرە دەتوانیت تەحکوم بکەیت بەهەموو سەرچاوە شاخاویەکانەوە.

بەم پیَیەش، ئەگەر حەکیمیَك بیەویَت بکەویَتە سەروی خەلَکەوە، پیَویستە خۆی بخاتە خوارویانەوە، ئەگەر بیەویَت خۆی بخاتە پیَشیانەوە، پیَویستە لەدوایانەوە برِوات... بەم پیَودانەگە، هەرچەندە لەسەروی خەلَکیشەوە بیَت، خەلَکەکە هەست بەقورساییەکەی ناکەن، هەرچەندیش لەپیَشیانەوە برِوات، وانازانن سوکایەتی پیَکردبن).

# بەشی حەڤدەیەم

## داواكاریەك كەبۆ هەموان باشە!

مـن لـە دەوروبـەری شارۆچكەی (جیسی جـایمس)ی ویلایـەتی (میسوری) پەروەردە بووم.سەردانی كێڵگەكانی (جایمس)م لە (كیرنی) سەر بەویلایـەتی (میسوری) دەكرد.ئەودەم هێشتر كوڕەكەی جیسی جایمس لەژیانـدا مـابوو. ژنەكـەی باسـی هەنـدێ لـەو چیرۆكانەی بۆ دەگێڕامەوە كە(جیسی) دەچوو شەمەندەفەرو بانكەكانی تاڵان دەكرد و ئینجـا هەرچـی دەسـتكەوت بوایـە دابەشـی دەكـرد بەسـەر جوتیـارە هەژارەكاندا، تاكو بتوانن قەرزو قوڵەكانیانی پێ بدەنەوە.

ڕەنگە بەكردنی ئەو كارە جیسی جایمس خۆی بەكەسێكی نمونەیی هاتبێتـە بەرچـاو، وەك چـۆن (داچ شـۆڵتز وكـراولی، ئـال كـابونی) دەیـانكرد.لەڕاستیـشدا هـەموو ئەوانـەی دەیـان بینیـت، بەوەشـەوە كەلەئاوێنـەدا ڕووبـەڕوو لەبـەردەمتا دەوەستێت( مەبەست لەخۆتە كە كاتـێ لەبـەردەم ئاوێنـەدا دەوەسـتیت، وێنەكـەت لەبەردەمتـدا ڕادەوەستێت... وەرگێڕ) – ئیعتیبـارێكی زۆر دائـەنێن بۆ خۆیـان.پێی

خۆشە نەرم ونیان بێت و منگەرایی وخود پەسەندی نەكات، دیارە بەمەزەندەی خۆی.

(ج. پیارپۆنت مۆرگان) لەپەرەگرافێكی شیكاریانەدا بۆمان ڕوون دەكاتەوە كەمرۆڤ كاتێ هەر كارێك دەكات دوو هۆكارو پاڵنەری بۆ كردنی كارەكەی هەیە: هۆیەكیان ئەوەیە كەهەست دەكات ئەوكارەی پێی هەڵدەستێت ڕاست ودروست وڕاستەقینەیە. مرۆڤ هەمیشە بیرلە هۆكارە ڕاستەقینەكان دەكاتەوە، ئیدی پێویست ناكات لەدووی پشت ڕاست كردنەوەی ئەو ڕاستی وناڕاستیە بچێت. وەلێ هەمووومان، لەبەر ئەوەی تەواو ئایدیایین، حەزمان لەوەیە سەرنجی زیاتر لەسەر ئەو هۆكار وپاڵنەرانە چڕبكەینەوە كەبەباش دێنە بەرچاو، بەم پێیەش بۆ ئەوەی بتوانیت خەڵكی بگۆڕیت، پێویستە ڕووی داواكاریەكان بكەینە لایەنە زۆر باشەكانیان.

ئایا ئەمە شتێكی باش ونمونەییە تاكو لەكارەكاندا كەڵكی لێ وەربگرین؟ باتەماشابكەین وحاڵەتەكەی (هاملتۆن ج. فاریل)ی سەرۆكی كۆمپانیای (فاریل میچیل) لەشاری (گلینولدن) ی ویلایەتی (پەنسلڤانیا) بەنمونە وەربگرین... بەڕێز فاریل، كرێ چیەكی هەبوو، زوو زوو بێتاقەتی دەكرد وهەڕەشەی ئەوەی لێدەكرد كەچوارمانگ بەر لەوەی ماوەی گرێ بەستەكەیان كۆتایی بێت، ماڵەكە بەجێ دەهێڵێت... كرێی مانگێكی ماڵەكە (٥٥)دۆلار بوو.

بەڕێز فاریل، ئەو بەسەر هاتەی لەبەردەم قوتابییەكانی پەیمانگاكەمدا گێڕایەوە وگوتی: (ئەوان بەدرێژایی وەرزی زستان لەماڵەكەی مندا مانەوە-لەو وەرزەشدا نرخەكان لەهەموو كاتێكی تر بەرزترن. من باشم

بەزانی زۆر زەحمەتە کەسێك بەر لە وەرزی پایز بێت و بیەوێ خانوو بەکرێ بگرێ.ئەمەش مانای وایە من بڕی(٢٥٠دۆلار) زیانم لێ دەکەوێ! بۆیە زۆر توڕە وبێتاقەت بووم).

لەکاتە ئاساییەکاندا، خۆم دەڕۆشتمە لای وئامۆژگاریم دەکرد تاکو گرێ بەستەکە بەباشی بخوێنێتەوە.پێم دەگوت ئەگەر خانوەکە چۆڵ بکات، پێویستە لەسەری بەگوێرەی گرێ بەستەکە کرێی هەموو مانگەکانم بەتەواوی بداتێ.دەشم توانی ناچاری بکەم هەموو کرێکەم بداتێ.

بەڵام ئەمجارەیان لەبری ئەوەی هەڵبچم وتوڕە ببم. بڕیارمدا هەندێ شێوازی تری لەگەڵدا پەیڕەو بکەم. بۆیە بەم شێوەیە لەگەڵیدا کەوتمە وتوێژەوە: (بەڕێز دۆ، من بەباشی گوێم گرت بۆ قسەکانت.بەڵام ئێستاش بڕوام بەوەنیە تۆ نیازی ئەوەت هەبێت خانوەکە چۆڵ بکەیت.چونکە ئەو چەندساڵەی لەکاری بەکرێداندا سەرقاڵ بووم، شتێ لەسروشتی مرۆڤ تێ گەیشتوم، بۆیە دەزانم تۆ پیاوێکی خاوەنی قسەی خۆتی.لەڕاستیشدا زۆر لەوە دڵنیام، تەنانەت ئامادەم گرە وبکەم لەسەر ئەوەی تۆ خاوەنی قسەی خۆتیت.

من پێشنیارێك دەخەمە بەردەستت، جارێ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بڕیارەکەت لاوەبنێ ودووبارە بیری لێ بکەرەوە. هەر لەئێستەوە تاکو سەرەتای مانگی داهاتوو، کەوەختی کرێدان دێت، مۆڵەتت بێت، کەهاتیتەوە چ بڕیارێکتدا، پێم ڕابگەیەنە.ئەو کاتە ڕێگەت پێ ئەدەم ماڵەکە چۆڵ بکەیت ولەناخی خۆشمەوە دان بەوەدا دەنێم کەمن لەهەڵسەنگاندنی تۆدا بەهەڵەدا چووم.بەڵام تائەم چرکە ساتەش پێم وایە

تۆ خاوەنی قسەی خۆتیت ولەسەر گرێ بەستەکەش بەردەوام دەبیت.بەر لەهەر شتێ، ئێمە یان مرۆڤین یاخود مەیمونین. هەرخۆشمان دەتوانین بڕیار بدەین کام لەو دووانە دەبین).

کەسەری مانگ هاتەوە، ئەو بەڕێزە خۆی هاتە لام وکرێکەی پێدام، لەگەڵ ژنەکەیدا باس وخواسی زۆری کردبوو، هاتبویە سەر ئەوەی کەخانوەکە چۆڵ نەکات... هەردووکیان پێکەوە گەشتبونە ئەو بڕوایەی کەباشترین ونمونەیی ترین شت ئەوەیە لەسەر گرێ بەستەکە بمێننەوە.

کاتێکیش(لۆرد سکلین) بینی ڕۆژنامەیەك وێنەیەکی ئەمی بلاو کردۆتەوە کەخۆی حەزی پێ ناکات، نامەیەکی نوسی بۆ سەرنوسەری ڕۆژنامەکە.بەلام تیایدا نەی گوتبوو: (تکادەکەم جارێکی تر ئەو وێنەیە بلاو مەکەنەوە، چونکە حەزی پێناکەم) بەڵکو.ڕووی داواکاریەکەی کردبویە بەهاجوانەکان، بەخاتری خۆشەویستی دایك بۆ منداڵەکەی، داوای لەسەر نوسەرەکە کرد: (تکام وایە ئەو وێنەیەم جارێکی تر بلاو نەکەیتەوە.چونکە دایکم پێی قایل نیە).

(جۆن د.ڕۆکفیلەر) پێی باش بوو پەیامنێرانی ڕۆژنامەکان وێنەی منداڵەکانی نەگرن، بۆ ئەم مەبەستە هات بەخاتری بەها جوانەکان داوای لێکردن.نەیگوت: (نامەوێت وێنەکانیان بلاو ببێتەوە) نەخێر.بەڵکو ئەو هەستەی بزاوند کەلەقولایی ناخی هەر کامێکماندایە بۆ دوورکەتنەوە لەئازار گەیاندن بەمنداڵەکانمان. بۆ یەگوتی: (گەنجە بەڕێزەکان، هەندێك لەئێوە منداڵتان هەیە، دەشزانن ئەوە لەبەرژەوەندی منالان نیە کەببنەخاوەنی ناوبانگێکی زۆر).

ئەو دەمەی (سایرۆس هـ.ك كورتیس) ی هەژار، گۆڕانی لەژیانیدا بەرپاکرد و، ڕێڕەوی ژیانێکی درەوشاوەی گرتە بەر، دواجار توانی ببێتە خاوەنی ڕۆژنامەکانی (ساتردەی ئیڤنینگ پۆست) و(لیدیز هۆم جۆرنالْ) ولەو ڕێگەیەشەوە ملیۆنەها دۆلای دەستکەوت. لەسەرەتاوە نەیدەتوانی نوسەرە پلە یەکەکان بەکاربێنێت تاکوبابەتی بۆ بنوسن، بۆیە پەنای بردە بەر بزواندنی بەها جوانەکانی نێو ناخی نوسەرەکان. لەم ڕێگەیەوە توانی نوسەرێکی وەکو خاتوو (لویزا مای ئەلکۆت) ی نوسەری ڕۆمانی (ژنەبچکەڵەکان) قایل بکات بابەت بۆ ڕۆژنامەکەی بنوسێت، لەکەکاتێکدا ئەم خانمە لەترۆپکی ناوباگیدا بوو.

ڕەنگە لێرەدا کەسێك بەگومانەوە بڵێت: (ئەم قسەیە بۆ نورسکلیڤ وژنە ڕۆماننوسە عاتیفیەکە دەست ئەدا. بەڵام من هیوادارم لەگەڵ ئەو مندالْە هارو هاجانەشدا بەسود بێت کەپێویستە لەسەر هەموان بەبەزەیی ودادگەرانە لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە).

لەوانەیە تۆ لەسەر هەق بیت، هیچ شتێ نیە بۆ هەموو حاڵەت وبارودۆخێك بگونجێت، تەنها یەك شتیش ناتوانێ بۆ هەموو کەس بەسودبێت.

جائەگەر تۆ بڕوات بەئەنجامەکان هەیە، ئیتر گۆڕانکاری دەکەیت؟ ئەگەر بڕوایشت نیە، بۆچی تاقی ناکەیتەوە؟ .

بەهەرحالْ، وادەزانم لەخوێندنەوەی ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە چێژوەردەگریت کەبەڕێز(جایمس ل.تۆماس)ی کۆنە قوتابیم بۆی باسکردم.پوختەی بەسەرهاتەکەش بەم شێوەیەیە:

شەش کەس لەکڕیارەکانی کۆمپانیایەکی فرۆشتنی ئۆتۆمبیل ئامادە نەبوون کرێی خزمەتگوزاریەکان بدەن بەکۆمپانیا، هیچکامیان نکوڵییان نەدەکرد لەکرێدان، بەڵام دەیانگوت کرێیەکی زیادەی تێدایە، هەریەك لەو شەش کەسە ئاماژەیان بەو هەڵەیە دەکرد، کۆمپانیاکەش دانی بەهەڵەکەدا نا، ئەمەش هەڵەی یەکەم بوو.

بەرپرسیارانی بەشی (سەنەدەکان) چەند هەنگاوێکیان نابۆ کۆکردنەوەی ئەو بڕەپارەیەی لای ئەوکەسانە بوو، بەڵام ئایا گومانت وایە لەو هەنگاوانەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا؟.

(١) هەموو کڕیارەکانیان بانگ کردوبە توندوتیژی پێیان گوتن کەپێویستە ئەوبڕە پارەیەی ماوەیەکە لەلایانە کۆبکەنەوەو بیدەنەوە بەکۆمپانیا.

(٢) ئەوەیان بۆ ڕوون کردنەوەکە کۆمپانیا لەسەر هەقە، بەو پێیەش کڕیارەکان لەسەرناهەقن.

(٣) پێدا گرییان لەسەر ئەوەکرد کەکۆمپانیا پتر لەوان شارەزای ئۆتۆمبیلەکانە.ئەی ئەنجام چی ڕوویدا؟.

(٤) ئەنجام؟ ئەوە بوو چونە نێو دەمبەدمەیەکی دووروودرێژەوە. ئایا هیچکام لەو ڕێگەو هەنگاوانە توانییان ئاوی دڵی کڕیارەکان بدەن وکۆتایی بەکێشەکە بێنن؟ تۆ خۆت دەتوانیت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە.

لەم قۆناغەدا، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە خەریك بوو جەنگێکی یاسایی لەگەڵ کڕیارەکاندا دەست پێ بکات، بەڵام کاتێ بەڕێوەبەری گشتی سەرنجیدا هەستی کرد ئەو شەش کەسە لەباشترین کڕیارەکانی

کۆمپانیان.بۆیە گەشتە ئەو بڕوایەی کەهەردەبێ هەڵەیەك ڕوی دابێ. هەڵەیەکی گەورە لەکۆکردنەوەدا. بۆیە (جیمس ل.تۆماس) بانگ دەکات رداوای لێدەکات (حسابە نەکراوەکان) کۆبکاتەوە.

بەڕێز(تۆماس) چەند هەنگاوێکی بۆ ئەو مەبەستە گرتەبەر، کەبریتی بوون لە:

(١) بەڕێز تۆماس دەڵێت: (سەردانی هەرکڕیارێکم دەکرد، بۆ ئەوە بوو بڕێ پارە کۆبکەینەوە کەماوەیەکی دوورودرێژ بوو لایان بوو، تەواو دڵنیاش بووین لەوەی حسابەکەی کۆمپانیا ڕاست ودروستە.بەڵام من بچوکترین وشەم لەبارەی ڕاستی و دروستی حسابەکەی خۆمانەوە نەدرکاندا.بەڵکو بۆم ڕوون دەکردنەوە کەهاتووم بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە بدۆزمەوە کەکۆمپانیاکردویێتی!.

(٢) پاش ئەوەی گوێم بۆ قسەکانی ئەوانیش ڕادەدێرا، بۆم ڕوون دەکردنەوە کە من هیچ ڕایەکم نیە تاکو پێیانی ڕابگەیەنم. کۆمپانیاش پڕوپاگەندەی ئەوە بۆ خۆی ناکات کەحسابەکەی خۆی ڕاستە.

(٣) بەهەر یەك لەو کڕیارانەم دەگوت، من تەنها گرنگی بەئۆتۆمبیلەکەی تۆ ئەدەم وجەنابت لەبەرتری لەو ڕووەوە.

بوارم ئەدایە بەئارەزووی خۆی قسەبکات، بەبایەخێکی زۆرەوە گوێم بۆ دەگرت وهاوسۆزیم بۆ دەردەبڕی، بەو جۆرەی ئەو پێی خۆش بوو.

(٥) دواجار، پاش ئەوەی توڕەیی کڕیارەکە نەدەماو هێور دەبویەوە، بەهاجوانەکانی نێوناخ و دەرونیم دەبزواند، سەرەتا پێیم دەگوت: (دەمەوێت جەنابت بزانیت کەمنیش هەست دەکەم مەسەلەکە بەباشی نەگوزەراوە.تۆش لەیەکێك لە فەرمانبەرەکان بێتاقەت بوویت.دڵنیات

دەكەم ئەوە دووبارە نابێتەوە... زۆر نیگەرانم! بەو پێیەی نێردراوی كۆمپانیاشم داوای لێبوردنت لێدەكەم، پۆزشت بۆدەهێنمەوە. كاتێ دانیشتم وگوێم بۆ قسەكانت ڕادێرا، ئەم توانی ئەچمە ژێركاریگەری نەرم ونیانی وئارامگری تۆوە... ئێستاش پاش ئەوەی هێوبویتەوە ومەسەلەكان لەلات ڕوون بونەوە، دەمەوێت داوای شتێكت لێ بكەم كەلەبەرمن بیكەیت. شتێ كەتۆ لەهەموو كەس باشتر دەتوانیت بیكەیت ولەهەركەسێكی تریش زیاتر لێی بەئاگایت... ئەمە فاتورەكەتە، دەزانم دەتوانیت زۆر بەباشی پڕی بكەیتەوە، وەك ئەوەی خۆت سەرۆكی كۆمپانیاكەبیت... ئەوەت بۆ جێ دێلم تاكو پڕی دەكەیتەوە.دوای ئەوەش هەرچی داوابكەیت جێبەجێی دەكەین.

ئایا لەكۆتایدا پارەی فاتۆرەكەیاندا؟ بەڵێ، بێگومان.نرخی فاتۆرەكان لەنێوان (١٥٠-١٤٠٠) دۆلاردا بوو. ئایا هیچكامیان یاخی بوون لەوەی پارەكەبدەن؟ بەڵێ!یەكێك لەكڕیارەكان ئامادە نەبوو ملیمێك بدات! بەڵام پێنج كڕیارەكەی تر هەموو پارەكەیاندا.پوختە وكورتەی بەسەرهاتەكەش ئەوەبوو كەلەماوەی دوو ساڵی داهاتو تردا كۆمپانیا شەش ئۆتۆمبیلی دایە دەست هەرشەش كڕیارەكەی!.

بەڕێز(تۆماس) دەڵێت: (ئەزمونەكانم فێریان كردووم، هەركاتێ هیچ زانیاریەكت نەبوو لەسەر كڕیارەكەت، تاكە ڕێسایەك بۆ ئەوەی بتوانی بەهۆیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكەیت، ئەوەیە گریمان دابنێیت كەئەم كەسە كەسێكی دڵسۆز وڕاستگۆیەو ئارەزوی لەوەیە هەركاتێ بڕوای بەوە هێنا كەحسابەكان ڕاست ودروستن، پارە وهەقەكانی بدات، . بەشێوەیەكی ڕوونتر دەتوانین بڵێین: خەڵكی خاوەنی ڕێزو حورمەتن وئارەزویان

لەوەیە بەڵێنەکانیان بەرنەسەر... من بڕوام وایە ئەو کەسەش کەحەزی لەفڕوفێڵ و چەواشەکاریە، بەنیازێکی باشەوە ڕەفتار دەکات ئەگەر هەست بکات تۆ پێت وایە ئەوکەسێکی سەرڕاست وشەریفە.

کەواتە، ئەگەر ئەتەوێت دڵی خەڵك ڕاکێشیت بەلای بیرو بۆچوونەکانی خۆتدا، واباشترە پێڕەوی لەم ڕێنسایە بکەیت: ڕوی داواکاریەکانت بکەرە بەها جوان وپیرۆزەکانی نێو ناخیان.

# دەروازەی چوارەم

ڕێگەکانی گۆڕینی خەڵك، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی سوکایەتی پێکردن وبێزارکردنیان).

ئەگەر بمانەوێت خەڵکی بگۆڕین بەبێ ئەوەی ببینە هۆی سوکایەتی پێکردن وبێزار کردنیان، پێویستە بەشێوەیەك دەست پێبکەین کەئەو پێی قبوڵ بێت وڕێزی لێ بگرێت.

چونکە کاردانەوەی ئەو، بەندە بە شێوازی مامەڵەی ئێمەوە.

# بەشی هەژدەیەم

## چۆن ڕەخنە دەگریت، بەبێ ئەوەی بەرانبەرەکەت بێزاربێت؟

دوانیوەڕۆیەک (چارلز شواب) بەکارگەیەکی پۆڵادا تێ پەڕی، بینی کۆمەڵێک دانیشتون وجگەرە دەکێشن، لەهەمان کاتدا لەسەروویانەوە تابلۆیەک هەڵواسرابوو لێی نوسرابوو (جگەرە کێشان قەدەغەیە!)... ئایا چارلز سەرنجیانی بۆ تابلۆکە ڕاکێشا وپێی گوتن: ئەرێ ئێوە خوێچندەواریتان نیە؟ .نەخێر، ئەوە شواب نیە کارێکی وابکات! بەڵکو بەرەو ڕوویان ڕۆشت ویەکی جگەرەیەکی دایە دەست هەر هەموویان وپێی گوتن: (زۆر مەمنون ئەبم ئەگەر لەدەرەوە ئەم جگەرەیە بکێشن). لەوکاتەدا ئەوان تێگەیشتن لەوەی شواب ئاگای لێیانە کەیاسایان پێشێل کردووە، بۆیە زۆر ڕێزیان لەشێوەی مامەڵەکەی گرت کە بەهیچ شێوەیەک فەرمانەکەی وەبیر نەهێنانەوە، بەڵکو دیاریەکی بچوکی دایە هەر یەکێکیان ووایلێکردن هەست بەبایەخی خۆیان بکەن.جائایا تۆ دەتوانیت خۆشەویستی پیاوێکی ئاوها لەناو دڵتا دەربکەیت؟ .

(جۆن وانامایکەر) یش هەمان شێوازی مامەڵەکەی پێڕەو کرد، ئەم ڕاهاتبوو لەسەر ئەوەی ڕۆژانە گەشتێك بەکۆگاگەورەکەیدا بکات کەدەکەوتە (فیلادلفیا) وە.ڕۆژێکیان بینی یەکێك لەکڕیارە ئافرەتەکان لەبەردەم ژمێریارەکەدا ڕاوەستاوە وهیچ کەس نیە گوێی پێبدات ومامەڵەکەی بۆ بەڕێ بخات.ئەی فرۆشیارەکانی کۆگاکە لەکوێ بوون؟ هەموو فرۆشیارەکان لەولاوە دانیشتبون و سەرقاڵی پێکەنین وشۆخی کردن بوون.(واناماکیەر) تاکە وشەیەکی لەدەم نەهاتە دەر.بەڵکو زۆر بەهێوری ڕۆشتە پشتی ئامێری ژماردنەکەوە و، مامەڵەی ژنەکەی بەڕێ کرد، دوای ئەوە بەڕێگەی خۆیدا ڕۆشت.

لەهەشتی ئازاری ساڵی ١٨٨٧دا، (هنری وارد بیچری) زمانپارا وکۆچی دوایی کرد، یان وەکو ژاپۆنیەکان دەڵێن کۆچی کرد بۆجیهانێکی تر.ڕۆژی یەکشەممەی داهاتوو، لایمن ئەیوت بانگهێشت کرا تاکو لەسەر بڵندگۆکەی بیچەرەوە مەوعیزە بکات.چونکە لەدوای مردنی (بیچر) ئیتر ئەو دوانگەیە بێدەنگ ببوو... (لای من ئەبوت) بەهەموو توانایەوە، (وەکو فلۆبیر) بەوپەڕی بایەخەوە وتارەکەی دەنوسی و پاشان پاکنوسی دەکرد، دواتر لەبەردەم هاسەرەکەیدا خوێندیەوە، وتارەکە وەك هەروتارێکی ئاسایی لەڕو لاواز بوو.ئەگەر ژنەکەی حیکمەتی نەبوایە لەوانەیە پێی بگوتایە (لایمن، ئەوە شتێکی بێ سودە، ئەم وتارەی تۆ والەخەڵك دەکات دەست بکەنە باوێشکدان وبنون، چونکە لەئینسکلۆپیدیا دەچێ. پێویستە تۆ لەپاش چەندین ساڵی دوورو درێژ کەلەبواری ئامۆژگاری ووەعزدا بەسەرت بروە، ئێستا زانیاریت زیاتر بوایە لەو بارەیەوە.بۆچی وەکو مرۆڤ نادوێیت؟ بۆچی بەشێوەیەکی

ئاسایی هەڵسوکەوت ناکەیت؟ ئەگەر ئەوقسە پوچانە بۆ خەڵك بخوێنیتەوە، خراپە دەدەیتە پاڵ خۆت).

هاوسەرەکەی خەریك بوو ئەوقسەیە بکات!بەڵام تۆ دەزانیت ئەگەر ئەوقسەیە بکرایە چی دەقەوما، خۆیشی ئەوەی دەزانی لەبەر ئەوە، ستایشی ئامۆژگاریەکانی کرد وگوتی: مەوعیزەکەت بۆ ئەوە باشە بکرێت وتارێك لەڕۆژنامەی (نۆرس ئەمریکان ڕیڤیو- North Amrican Review)دا، لەهەمان کاتدا پێشنیاری ئەوەیشی کرد کەوەکو مەوعیزە یان وتارێ کە بۆخەڵك بخوێندرێتەوە، دەست نادات!!.

لایمەن ئەبوت، هەڵەکانی خۆی دۆزیەوە، بۆیە کاغەزی وتارەکەی دڕاند، دواتر مەوعیزەکەی پێشکەش کرد بەبێ ئەوەی هیچ تێبینیەکی پێش وەخت ڕەچاو بکات.

بەم جۆرە، ئەگەر دەتوێت خەڵکی بگۆڕیت بەبێ ئەوەی ببیتە هۆی بێزار بوون ودڵتەنگکردنیان ئەوا کار بەم ڕێسایە بکە:

بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئاماژە بەهەڵەکانیان بدە!.

# بەشی نۆزدەیەم

## یەکەمجار، باسی هەڵەکانی خۆت بکە...

چەندسـاڵێک لەمەوبەر (جـۆزفین کـارنگی) خوشـکەزام، مـاڵی خـۆی لە(کنساس) بەجێ هێشت و، ڕووی کردە نیویۆرک تاکو لەلای من ببێتە سکرتێرە.ئەو دەمە تەمەنی نۆزدەساڵان بوو، سێ ساڵ بوو لەقۆناغی دواناوەندی دەرچوو بوو، ئەزمونی کرداریشی سێ کەڕەت سفر بوو!! بەڵام ئێستا یەکێکە لەباشترین سکرتێرەکان... ڕۆژێکیان ویستم ڕەخنەی لێبگرم، بەڵام لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەی کارنگی!پەلەمەکە... تەمەنی تۆ دوو ئەوەندەی تەمەنی جۆزفینە، دەئەوەندەی ئەو ئەزمونی کرداریت هەیە.ئیتر چۆن چاوەڕوان دەکەیت، ئەویش هەمان بۆ چون ودانایی و زانیاری تۆی هەبێت، لەکاتێکدا ڕەنگە ئەوانەی تۆش شتانێکی ئاسایی بـن؟ ... تۆزقاڵـێ ڕاوەسـتە! ئـەی دیـل!ئـەرێ تـۆ خـۆت کەلەتەمـەنی نۆزدەساڵیدا بویت چیت دەکرد؟ ئایا ئەو هەموو هەڵە وپەڵەیەت لەبیرە کەئـەنجامت دەدان؟ ... کاتـێ بـەبێ لایـەنگری کـردن بـیرم لێکـردەوە، گەشـتمە ئـەو دەرەنجامـەی کـە جـۆزفین لـەمن باشـترە کەلەتەمـەنی

نۆزدەساڵیدا بووم، جێگەی نیگەرانیشمە دان بەو ڕاستیەدا بنێم کەمن لەم ڕووەوە موجامەلەی ناکەم!.

بەو پێیە، هەرکاتێ بمویستایە سەرنجی جۆزفین بۆ لای هەڵەیەکی ڕابکێشم، ڕاهاتبووم لەسەر ئەوەی بەم ڕستانە دەست پێ بکەم: (جۆزفین گیان، تۆهەڵەیەکت کردووە، بەڵام خودا ئاگادارە لەو هەڵانە خراپترنیە کەمن لەتەمەنی تۆدا ئەنجامم ئەدان.تۆ بەزانستەوە لەدایکت نەبویت، چونکە زانست بەدەست نایەت لەڕێی ئەزمونەوە نەبێ.هەرچەندە ئێستا تۆباشتریت لەمن لەوکاتەی لەتەمەنی تۆدا بووم.من لەو تەمەنەدا کاری خراپ ودەبەنگانەی زۆرم دەکرد، بەجۆرێ هەڵەکانی ئەوکاتەم وایان لێکردوم نە ڕەخنە لەتۆبگرم ونە لەهیچ مرۆڤێکی تر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا پێت وانیە شتێکی باشە ئەگەر ئاواو ئاوا بکەیت؟ ).

شتێکی زۆر ناڕەحەت نیە ئەگەر گوێ بۆ ژماردنی هەڵەکانت بگریت، بەمەرجێك ئەو کەسەی قسەت بۆ ئەکات دان بەو ڕاستیەدا بنێت کەخۆیشی بێ هەڵەوکەم وکووڕیی نیە.

شازادە (فۆن بیلۆ) لەساڵی (١٩٠٩)دا هەستی کرد، پێویستە بەو شێوەیە ڕەفتار بکات... ئەم لەوکاتەدا کە(ویلهلهم) ی لوت بەرزی بەناوبانگ، دوایەمین قەراڵەکانی ئەڵمانیا لەسەر کورسی دەستەڵات بوو، ڕاوێژکاری پادشابوو.

پادشا خەریکی دروستکردنی سوپایەك وکەشتیگەلێکی دەریایی دابوو کەتادەهات لەجیهاندا سەنگی پەیدا دەکرد.لەم ئاومەوەدا شتێکی سەیر ڕویدا، قەراڵ باسی هەندێ شتی باوەڕپێنەکراوی کرد، هەندێ شتی گوت کەتەواوی کیشوەری ئەورووپای هێنایەوە لەرزە وسەدا

ودەنگۆکەی جیهانی تەنیەوە. بۆئەوەی قەیرانەکە پتر ئاڵۆزببێت، قەراڵ کاتێ لەئینگلتەرا میوان بوو هەندێ بانگەشەی خودپەسەندانە وپوچی تریشی بڵاوکردەوە.فەرمانێکی شاهانەیشی دەرکرد تاکولێدوانەکانی لەرۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)دا بڵاوبکەنەوە... لەولێدوانانەدا (بۆنمونە) گوتبوی: من تاکە ئەڵمانیەکم، هەست بە دۆستایەتی لەگەڵ ئینگلتەرادا دەکەم.یاخود گوتبوی: بۆ دژایەتی کردنی ژاپۆن کەشتیگەل بنیات دەنێم.یان گوتبوی: من تاکەکەسێکم ئینلگتەرام ڕزگارکردوە لەوەی نوقمی تەپوتۆزی ڕوسیا وفەرەنسابێت... هتد.

لەماوەی ئاشتیدا لەئەوروپاکەسەد ساڵی ڕەبەقی خایاند، هیچ پادشایەکی ئەوروپی لێدوانی قەڵساکاری بەوشێوەیەی لەدەم ناهاتۆتەدەرەوە.بۆیە کیشوەری ئەوروپا شڵەژا وبەتەواوی توڕەبوو... ئینگلتەرا گڕی گرت، پیاوانی دەوڵەتی ئەڵمانیابەتەواوی توشی شۆك بوون!.

لەمیانی ئەم شڵەژانەدا، ترس چوەدڵی قەراڵەوە، بۆیە پێشنیاری کرد بۆشازادە (فۆن بیلۆ)ی ڕاوێژکاری پادشا، تاکوئۆباڵی لێدوانەکان بخاتە ئەستۆی خۆیەوە: بەڵێ، دەیویست فۆن بیلۆ دان بەبەرپرسیارێتی خۆی لەو لێدوانانەدا بنێت وڕای بگەیەنێت کەئەم ئامۆژگاری پادشای کردوە تاکوبەوشێوەیە بدوێت!!.

فۆن بیلۆ، لەم پێشنیارە نارازی بوو، گوتی: (بەڵام پادشای مەزن، پێم وایەشتێکی ناماقوڵە گەر هەرکەسێك لەئەڵمانیا و ئینگلتەرادا بڕوابەوە بکات کەمن ئیوەی خاوەن شکۆ ئامۆژگاری دەکەم، تاکوبەو شێوەیە بدوێن)!.

هەرکە ئەمەی گوت، فۆن بیلۆ هەستی کرد، هەڵەیەکی گەورەی کردووە.چونکە قەڕاڵ زۆر تورەبوو، قیڕاندی: (تۆمن بەکەردەزانیت، پێت وایە هەڵەی وادەکەم کەناگونجێت جەنابت ئەوهەڵانە بکەیت)!.

لەم کاتەدا ئیدی(بیلۆ) هەستی کرد، پێویست بوو بەرلەوەی ڕەخنەی لێبگرێت، ستایشی بکردایە.بەڵام تازەکارلەکار ترازابوو... سەربارى ئەوەش بەشێوەیەکی جادوگەرانە دەستی کردە ستایش کردنی قەڕاڵە و، لەوەڵامیدا بەڕێزەوە گوتی: (نا هەرگیزمەبەستم ئەوەنەبوو.چونکە خاوەن شکۆی بەڕێز لەزۆر ڕووەوە لەمن شارەزاتر وکارزان ترە، نەك بەتەنها لە ڕووی سەربازی ودەریاوانیەوە، بەڵکو بەرلەهەرشتێ لەزانستە سروشتیەکاندا. من زۆر بەتامەزرۆیی وسەرسوڕمانە گوێم بۆشل کردبویت کاتێ شیکردنەوەت لەسەر بارۆمەتر وبێ تەل پێشکەش دەکرد، یاخودکاتێ لەبارەی تیشکی ڕۆنتگنەوە دەدوایت.من زۆر بەداخەوە لەهیچ لقێکی زانستە سروشتیەکان شارەزانیم، بچوکترین زانیاریم لەبارەی کیمیا وفیزیاوە نیە، ناتوانم ساکارترینی دیاردە سروشتیەکان شیی بکەمەوە... (بەڵام من) فۆن بیلۆ بەردەوام بوولەسەر قسەکانی وگوتی: (لەبری ئەوە، کەزانیاریم لەبارەی مێژووەوە هەیە، ڕەنگە هەندێ وردەزانیاری سودبەخشیشم لەسەر سیاسەت وبەتایبەت لەبواری دیبلۆماسیدا هەبێت).

بەم قسەیەڕوخساری قەڕاڵ گەشایەوە.چونکە فۆن بیلۆ ستایشی کردبوو.لەپلە وپایەی بەرزکردبویەوە. بەوشێوەیە قەڕاڵ ئامادەبوو لەبەرانبەر ئەوستایش کردنەدا لەهەمووشتێ ببورێ... بۆیە

بەدڵگەرمیەوە گوتی: (ئەدی هەمیشەپێت ناڵێم ئێمە تەواوکەری یەکین؟ پێویستە هەمیشە هەردوایەکگرتووبین).

ئینجا چەندجارێ تەوقەی لەگەڵ فۆن بیلۆداکرد، ئەوڕۆژە تاکوئێوارە گەرم وگوڕبوو، پاشان بەهەڕەشەوە مشتەکۆڵەی توندکرد وبەرزی کردەوە وگوتی: (هەرکەس شتێکم لەدژی شازادە بیلۆپێ بڵێت، لوتی دەشکێنم)!.

(فۆن بیلۆ) لەکاتی گەنجاودا خۆی ڕزگارکرد.بەڵام لەگەڵ ڕەفتاری باش ولێزانینەکەیدا، یەک هەڵەی کرد: دەبوا قسەکانی بەباسکردنی ناتەواویەکانی خۆی وستایشکردنی قەراڵی دەست پێ بکردایە.

نەک بەوشێوەیەی گوایە قەراڵ ناتەواوە وپێویستی بەڕێنمونی کەرێ هەیە!.

جائەگەر چەندرستەیەکی خۆبەکەمزانین وستایشکردنی کەسی بەرانبەر بێتەهۆی ئەوەی قەراڵێ بکاتە هاوڕێیەکی دڵسۆز، ئەوا بیرلەوە بکەرەوە کەسوکایەتی پێکردن وستایش کردن لەژیانی ڕۆژانەماندا چ کاریگەریەکیان دەبێت، ئەگەر ئەم شێوازە بە شێوەیەکی ڕاست ودروست بەکاربهێنیت، ئەوا کاریگەریەکی ئەفسانەیی دروست دەکات لەنێوپەیوەندیە مرۆییەکانماندا.

بەوجۆرە، ئەگەر ئەتەوێ خەڵکی بگۆڕیت بەبێ ئەوەی قەڵس وبێتاقەت وبێزاریان بکەیت، ئەواکاربەم ڕێسایەبکە:

بەرلەوەی ڕەخنەلەوی تربگریت، باس لەهەڵەو کەموو کوڕیەکانی خۆت بکە.

# بەشی بیستەم

## هیچ کەس حەزناکات فەرمانی بەسەردا بکرێ!

ئێوارەیەک شەرەفی ئەوەم پێدرا لەگەڵ خاتوو(ئیداتاربل)ی ڕێبەری ژیاننامەنوسە ئەمریکیەکاندا، نانێک بخۆم.کەباسی ئەوەم بۆکرد نیازمەکتێبی( چۆن هاوڕێ پەیدادەکەیت)بنوسم.دەستمان کردە گفتوگۆ لەبارەی هەڵس وکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا.ئەوخانمە باسی ئەوەی بۆگێڕامەوە کەوەختێ سەرقاڵی‌نوسینەوەی ژیاننامەی (ئۆین یونگ) بووە.چاوپێکەوتنی لەگەڵ پیاوێکدا کردووەکەسێ ساڵ لەگەڵ(یونگ)دا لەیەک نوسینگەدا کاریان پێکەوە کردووە.ئەوپیاوە باسی ئەوەی کردووە کەلەماوەی ئەوچەندساڵەدا، هەرگیز نەی بیستوە(یونگ) فەرمان بۆهیچ کەسێک دەربکات.بەڵکو پێشنیاری پێشکەش دەکرد.نەک فەرمان!!.

یونگ نەیدەگوت(ئەمەبکەیان ئەوەبکە) یان (ئەمەمەکە ئەوەبکە).بەڵکودەیگوت: (دەتوانیت وابکەیت) یاخود: (ئایا پێت وایە ئەوکارە سودبەخش بێت؟ ).

هەمیشەلەدوای نوسینی نامەیەک دەیگوت: (ڕات چییە لەسەرئەونامەیە؟ ) هەرکاتی بەسەرنامەی یەکێک لەهاوکارەکانیدا

بچوایەتەوە، دەیگوت: (لەوانەیە ئەگەر بەم شێوازەی تر دای بڕێژیتەوە، باشتربێ!).

هەمیشە هەڵی دەدایە کەسەکە، تاکو خۆی هەستێ بەئەنجامدانی کارەکە... داوای نەدەکرد لەهاوکارەکانی تاکوکارێ ئەنجام بدەن، بەڵکو لێیان دەگەڕاخۆیان بەئەرکەکانیان هەستن ولەهەڵەکانیانەوەفێربێن.

ئەم شێوازی مامەڵەیە ڕێگەکەئاسان دەکات بۆکەسی بەرانبەر تاکوهەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە.هەروەها ڕێزی مرۆڤ دەپارێزێت وهەست بەگرنگی خۆیشی دەکات.وایشی لێدەکات حەزلەهاوکاری بکات لەبریتی شۆڕش وهەرا ویاخی بوون.

کەواتە ئەگەر دەتەوێت خەڵکی بگۆڕیت، بەبێ ئەوەی بێزاریان بکەیت.کاربەم ڕێسای دووەمەبکە:

پرسیار بکە.لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ فەرمان دەربکەیت.

# بەشی بیست ویەکەم

## لێگەڕێ، ئاوی ڕوی خۆی بپارێزێ!

چەندساڵێك لەمەوبەر کۆمپانیای گشتی کارەبا، فەرمانێکیبۆدەرچوو ئاکو(چارلز ستاینمتز) لەسەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکە لابەرێ ودووری بخاتەوە.

ستاینمتز بلیمەتێکی پلەیەك بوو لەکارەبادا، بەڵام لەبەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەدا ئەوبلیمەتیەی نەبوو.لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپانیا نەیدەوێرافشار بخاتە سەری.چونکە پێویستی زۆری هەبوو بەبوون ومانەوەی ئەوکابرایە.لەبەرئەوەهاتن پۆستێکی تریان پێبەخشی.پۆستەکەیان ناونا(ئەندازیاری ڕاوێژکاری کۆمپانیای گشتی کارەبا) واتە ناوێکی تازەیان دانابۆ ئەوکارەی کەپێشتر دەیکرد.لەهەمان کاتداپۆستە ئیداریەکەیان لێ وەرگرتەوە ودایان بەکەسێکی تر.ستاینمتز بەم گۆڕانکاریە خۆشحاڵ بوو، هەروەها بەرپرسیارانی تری کۆمپانیاش پێی شادومان بوون.چونکە ئەوان دەربارەی ئەو ئەستێرە هەستیارەی کۆمپانیاکەیان پێشتر ڕاوێژیان کردبوو، لەئەنجامیشدا توانییان ئامانجەکەیان بەدەست بێنن بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گەردەلولێك بەدوای خۆیدا بهێنێت... چونکە لێگەڕان ئاوی ڕووی بپارێزێ!.

لێگەڕان ئاوی ڕووی خۆی بپارێزێت!چەند ئەم پەیڤە گرنگە! کەسانێکی زۆرکەم لەئێمەدا هەن کەلەئاقاری ئەو پەیڤەدا ڕادەوەستن ولێی دەکۆڵنەوە!... ئێمە زۆربەتوندی هەستی بەرانبەرەکانمان پێشێل دەکەین... بەردەوام دەگەڕێین تاکوهەڵەکانی خەڵکی بدۆزینەوە ودەست بکەینە هەڕەشە وگوڕەشە کردن.ئەوەتا لەبەرچاوی خەڵکیدا ڕەخنەلەمنداڵ یان لەفەرمانبەرەکانمان دەگرین، بێ ئەوەی هەست بەوئازارەبکەین کەبەو هۆیەوە دووچاری دەروونی ئەوکەسانە دەبێت!لەمەلەکاتێکدا چەند چرکەیەك بیرکردنەوە و، دوو وشەی جوان ونەرم ونیان، تێگەشتنێکی قوڵ لەهەڵس وکەوت وڕەفتاری بەرانبەرەکانمان، ڕەنگە ببێتەهۆی ئەوەی ئازار وژانیان لێ دووربکەوێتەوە!.

باهەرکاتێ پێویست بوو فەرمانبەرێ یاخود خزمەتگوزارێ دەربکەین ئەوەمان لەبیربێت کە(دەرکردنی فەرمانبەران سەرچاوەی خۆشحاڵی نیە... ئەگەر تۆش دەربکرێیت هەرگیز شادومان نابیت).

(ئەمەی خوارەوە بڕگەیەکە لەو نامەیەی کە(مارشاڵ گرانگر) بۆی ناردووم... ئەوکەژمێریارێکی بەناوبانگە لەنامەکەیدا دەڵێت: (زۆربەی ئیش وکارەکانی ئێمە وەرزانەن، لەبەرئەوە پێویستە لەمانگی ئاداردا زۆربەی کرێکارەکانمان دەرکەین... ئەوئەرکەش دەبوا ئێمە ڕاییمان بکردایە لەکاتێکدا کەس حەزی لەئاوائەرکێك نیە... بەلام نەریتمان وابوو، بەم شێوەیە کەسێکمان لەکارکردن دووردەخستەوە: (بەڕێز سمیس، فەرمووو دانیشە.واوەرزی کارکردنمان کۆتایی هات.پێناچێت

هیچ كارێكمان مابێت. تۆخۆت لەوەتێ دەگەیت كەجەنابت تەنها لەوەرزی كاركردندا لێرە كاردەكەیت، بەهەرحاڵ، ... هتد).

لەم بارەدا بەرەنجامی ئەوكارە بێ ئومێدبوونی كەسی بەرانبەر دەبێ. واهەست دەكات دابەزێنراوەتە خواری خوارەوە. چونكە زۆربەیان مەوڵیان بۆ بڕژێوی دەدا. بۆیە چیدی هێچ خۆشەویستیەكیان نامێنێ بۆئەو كارگەیەی كەلەسەر كارەكانیان دەری كردن.

دواجار بڕیارمدا بەشێوەیەكی جوانتر وشایستەتر مامەڵەبكەم لەگەڵ ئەوانەی تردا كەهێشتر لەلامان مابونەوە. بۆیە هەریەكیانم بەجیا بانگ دەكرد، پاش ئەوەی سەرنجی ووردم ئەدا لەوكارەی كەلەزستاندا كردبووی، ئەوجا پێم دەگوت: بەڕێز سمیس، جەنابت كارێكی زۆر جوانت كردووە(ئەگەر هەربەڕاستی كاری جوانی كردبێ). بەڵام كاتێ تۆ نێردراویت بۆ(بونارك). كارێكی سەخت وناڕەحەت خرایە ئەستۆت. كەچی تۆبەوپەڕی ڕێكوپێكی كارەكانت ڕاپەڕاند. ئێمە حەزدەكەین بزانیت كەكۆمپانیاكەمان شانازی بەجەنابتەوە دەكات. تۆ فەرمانبەرێكی چالاكیت، كۆمپانیاكەمان بڕوای بە تۆ هەیە، هیوامان وایە بیێنیتەوە. ئەوەت لەیادنەچێت!).

ئەی بەرەنجامی ئەم شێوە ڕەفتارەچیە؟ فەرمانبەرەكان كەلەكۆمپانیا دێنەدەرەوە هەستیان زۆر لەوەباشترە كەهەست بە دەركردن بكەن. هەست ناكەن دابەزێنرابێنە خواری خوارەوە. چونكە دڵنیابوون لەوەی ئەگەركارمان بمایە، دەستمان لێ بەر نەئەدان. هەركاتێكیش كاری ترمان هەبوو، دەتوانن زۆر بەشادومانی وئاسایی بگەڕێنەوە بۆلامان.

دویت مورو، توانایەكی زۆر نائاسایی هەبووبۆ ئاشتكردنەوەی دووكەسی ناكۆك، ئەگەرچی لەوەشدابن دەست لەبینەقاقای یەكترگیربكەن. بەڵام چۆن؟ دویت، دەگەڕابەدوای لایەنەباشەكانی هەریەك

لەودوو کەسە ناکۆکەدا وباسی دەکرد... ناکۆکیەکەشیان لەسەرهەرچی بوایە، هیچکامیانی بەهەڵە لەقەڵەم نەئەدا.

پیاوە مەزنەڕاستەقینەکان. زۆرلەوەگەورەترن کاتیان لەوەدا بەفیڕۆبدەن کەتەماشای سەرکەوتنەشەخسیەکانی خۆیان بکەن.بۆنمونە: لەساڵی ١٩٢٢دا، لەپاش چەند سەدەیەك لەدوژمنایەتیەکی تاڵ، تورکەکان بڕیاریاندا بۆهەتایە یۆنانیەکان لە ناوچەتورکیەکان دووربخەنەوە.

مستەفاکەمال لەبەردەم سەربازەکانیدا (وتارێکی ناپلیۆنی) دا... تیایدا گوتی: (دەریای ناوەڕاست ئامانجی ئێوەیە).لەم کاتەدا ئیدی یەکێك لەجەنگەسەختەکانی مێژوی نوێ هەڵایسا.تورکەکان تیایدا سەرکەوتن. لەئەنجامدا هەردوو سەرکردەنی یۆنانی (تریکوبیس) و(دایونیس) ڕوویان کردە کۆشکەکەی کەمال بۆخۆبەدەستەوەدان... تورکەکان خوازیاری ئەوەبوون نەفرەتەکانی ئاسمانیش دابەزێتە سەر دووژمنەدۆڕاوەکانیان، بەڵام ڕەفتاری کەمال ڕەهابوو لەهەستی سەرکەوتن.بۆیە دەستی هەردووسەرکردەکەی گرتوپێی گوتن: (فەرموودانیشن، لەوانەیە هیلاك بن) دوای ئەوەی بەووردی باسیان لە هێرشەکەکرد، قورسایی شکستەکەیانی لەسەر کەم کردنەوە، دروست وەك ئەوەی سەربازێ لەگەڵ سەربازێکی تردا بدوێ، پێی گوتن: (جەنگ یاریەکە، زۆرجار باشترین پیاوەکانیش تیایدا دەدۆڕێن).

تەنانەت لەترۆپکی سەرکەوتنیدا، کەمال ئەم ڕێساگرنگەی لەبەرچاوبوو: لێگەڕێ، ناوی ڕووی خۆی بپارێزێ.